تیمیة وه ( حکم السفور والحجاب) ى شيخ عبدالعزيز عبدالله بن باز وه ناميلكەى ( الصارم المشهور على المفتونين بالسفور) ى شيخ حمود بن عبدالله التويجرى وه ( رسالة الحجاب ) ى شيخ محمد بن صالح العثيمين ئەوەنده ناميلكەيه بەسه كه بخوێندرێتەوه.

وه باش بزانه خوشكى موسڵمان ئەو زانايانەش كه دەرخستنى دەم و چاويان بۆ مباح كردووى تەنها لەبەر ئەوەيه دەڵێن لەبەر ئەمين بوون له فيتنه و كەسيش له فيتنه ئەمين نيه بەتايبەت له ئێستادا هۆكارى بڵاو بوونەوەى دين كەم بۆتەوه و شەرم و شكۆ نەماوه بانگەوازى كاران بۆ فيتنه زۆر بوون وه ئافرەت به فيتنه براوه بەوەى كه چەندەها بۆيه و ئاڵا و واڵا دەدات له دەم و چاوى كه ئەوه بانگەوازيه بۆ فيتنه . جا بۆيه ئاگاداربه خوشكى موسڵمان وه پابەند به بەو حجابه كه ئەتپارێزێ له فيتنه به ئيزى خوا وه هيچ زانايەكى بەرزى ئيسلام لەگەڵ ئەو حيجابه نين كه نيفاقى تێ ئەكەوێت واتا كه له كۆمەڵگايەكى باڵا پۆش بوون حجاب دەكەن ئەگينا گوێى پێ نادەن ئەگەر له شوێنى گشتيدا بن حيجاب دەكەن ئەگەر چوونه لاى بەرگ درووبەك يان زەرەنگەر يان نەخۆشخانه ئەوا قۆڵ و دەم و چاويان دەردەخەن وەك لاى كەسێكى مەحرەمى خۆيان بن .

بۆيه دەڵێم له خوا بترسه ئەى ئەوەى ئەو جۆره شتانه ئەكەيت .وه چەند جار له فرۆكەخانەكان دەبينرێ ژنان كه له فرۆكه دادەبەزن ئنجا حجاب دەكەن حجاب بووه به نەريتێكى كۆمەڵگا لايان نەك شتێك كه خواى گەوره شەرعى كردووه كه واجب بێت لەسەريان .

ئەى ئافرەتى موسڵمان دڵنيابه باڵاپۆشى دەت پارێزێت له سەرنج و تێروانينى خەڵكى دڵ نەخۆش وه ناهێڵێت كەس به چاوى تەماع سەيرت بكا گوێ مەده بەو بانگەشانەى كه دژايەتى باڵاپۆشى دەكەن دژت يان له بەها و نرخى باڵاپۆشى كەم دەكەنەوه ئەوانه خێريان بۆ تۆ ناوێت هەروەكو خواى گەوره دەفەرموێ : ﴿وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا (٢٧)﴾ النساء.

## ((بەشی پێنجەم ))

## ( فی بیان أحكام تختص بالمرأة فی صلاتها )

## چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەتان لە کاتی نوێژدا

**پارێزگاری لە نوێژەکانت بکە لە کاتەکانی خۆیدا بە مەرج و ڕوکن و واجبەکانیەوە خوای گەورە بە دایکی ئیمانداران دەفەرموێ:** [ وَأَقِمْنَ الصَّلاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ] الأحزاب.

**واتا: نوێژەکانتان بکەن بە ڕوکن و واجب و خشوعەوە ، وە زەکاتی ماڵتان بدەن ، وە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خودا بکەن (ﷺ) .**

**ئەو فەرمانە هەموو موسڵمانێك دەگرێتەوە لە ئافرەتان. نوێژ دووەم پایەیە لە پایەکانی ئیسلام عەمودی ئیسلامە هەرکەسێ وازی لێ بێنێ و نەیکات لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە و کوفری کردووە ، نە دینی هەیە و نە موسڵمانە کەسێك نوێژ نەکات لە ئافرەتان و پیاوان هەرکەسێك دوای بخات لە کاتەکەی خۆی بە بێ هیچ عوزرێکی شەرعی وە لە دەستی چووە و فەوتاندویەتی . خوای گەورە دەفەرموێ:** [ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا (٥٩) إِلاَّ مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلا يُظْلَمُونَ شَيْئًا (٦٠) ]مريم.

**واتا: لە پاش ئەم پێغەمبەرە باشانە و شوێن کەوتووە چاکەکانیان کەسانێکی خراپ هاتن کە نوێژەکانیان فەوتاند و ئەنجامیان نەدا یان لەسەر شێوازی خۆی نەیان کرد یان لە کاتی خۆیدا نەیان ئەکرد وە شوێنی هەوا و ئارەزوو شتە حەرامەکان کەوتن ئەوانە تووشی شەڕ و خراپە و زەرەرمەندی ئەبن تەنها کەسانێك نەبێ کە تۆبە بکەن و ئیمان بێنن و کردەوەی چاکە بکەن ئەمانە دەچنە بەهەشتەوە چوونکە تۆبە کردن تاوانی پێشتر ناهێڵێ وە هیچ زوڵم و ستەمیان لێ ناکرێ و پاداشتیان لێ کەم ناکرێتەوە.**

حافظ ابن کپیر  ئەفەرمویٚ لە تەفسیرەکەیدا  وە کۆی ڕازی زایان کە لە دەست دانی نوێژ وە نەکردنی لە کاتی خۆیدا هەتا کاتەکەی ئەڕوات ( الغی) ئەفەرموون دۆڵێکە لە جەهەنەم .

## چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەتان جیا لە پیاوان :

١–ئافرەت نابێت بانگ بدات و قامەت بکات چونکە لە شەرعدا هاتووە  کە بانگ دان دەبێ دەنگی بۆ بەرز بکرێتەوە وە ئافرەتیش نابێ دەنگی بەرزبکاتەوە  لە (مغنی) دا هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان زانایاندا .

٢–ئافرەت هەموو شوێنێکی عەورەتە جگە لە دەم و چاوی نەبێ وە دەست و قاچەکانی خیلافی تێدایە  نابێ هیچ کەس بیبینێ جگە لە مەحرەمی خۆی وە ئەگەر نامەحرەم بینی دەبێ دای پۆشێ وە دەبێ لە دەرەوەی نوێژیش دای پۆشێ وە سەری داپۆشێ وە گەردن و ملی داپۆشێ تا دەگاتە قاچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (لاتقبل صلاة الحائض إلا بخمار).

واتا : نوێژی ئافرەت وەرناگیرێ کە چووبێتە حەیزەوە بەسەر پۆش نەبێ کە ئەبێ سەر و مل و گەردنی داپۆشێ .

أم سلمه پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ): ( أَتُصَلِّي الْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ ؟ فَقَالَ : إِذَا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا ).

واتا : أم سلمه ( ڕەزای خوای لێ بێ )  گێڕدراوەتەوە کە بەڕاستی پرسیاری کردوە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا ئافرەت نوێژ دەکات لە کراس و سەرپۆش بێ ئەوەی هەردوو پێی داپۆشێ .

فەرمووی ئەگەر کراسەکەی درێژ بێت و هەردوو قاچی داپۆشێ.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە ئەبێ  لە نوێژدا سەر و ملی داپۆشێ .. سودی فەرمودەی عائیشە ، وە هەموو لاشەی داپۆشێ تا پێیەکانی  ئەوەش سودی فەرموودەی أم

سلمه .. ئەتوانیٚ دەم و چاوی دەرخات بە مەرجیٚ کەسی بیٚگانە نەیبینیٚ بە کۆی دەنگی زانایان .

درع : واتا کراس

ازار : واتا شەروالٚ لە ژیٚر کراسەوە لە پیٚ دەکریٚ

خمار : واتا سەرپۆش

شیٚخی اسلام ابن تیمیة ئەفەرمویٚ: ئافرەت ئەگەر بە تەنهاش نویٚژ بکات ئەبیٚ لەچك بکات لە غەیری نویٚژ دەتوانیٚ لە ماڵەکەی خۆی سەرپۆش نەکات چونکە خۆڕازاندنەوە و جلی جوان لە ناو نویٚژدا حەقی خوای گەورەیە بۆ کەس نیە تەواف بکات بە دەوری کەعبەدا بە ڕووتی ئەگەر بە تەنهاش بیٚ لە شەویشدا . وە نویٚژیش بە ڕووتی نابیٚت بکات ئەگەر لە شویٚنیٚ بە تەنهاش بیٚ چونکە ڕووتی لە ناو نویٚژدا نەبەستراوە بەوەی کە شویٚنی سەیر کردنی خەڵکی بیٚ وە بە پیٚچەوانەشەوە .

لە کتیٚبی ( المغنی) هەموو لاشەی ئافرەت ئەبیٚ داپۆشراو بیٚ لە نویٚژدا ئەگەر شویٚنیٚکی دەرکەویٚ نویٚژەکەی ڕاست نیە ئەگەر شویٚنیٚکی کەمیش بیٚ ئەمە ڕەئی ئیمام مالك و أوزاعی و شافعی یە .

٣-ئەبیٚ ئافرەت خۆی کۆبکاتەوە لە کاتی ڕکوع و سجود برندا لە جیاتی ئەوەی بیکاتەوە دەست و قاچی .

ئافرەت دەست و پیٚی خۆی کۆدەکاتەوە و دەیلکیٚنیٚت بە خۆیەوە لە کاتی ڕکوع و سجودا لە جیاتی ئەوەی دەست و پیٚی بلاٚو بکاتەوە وە دادەنیشیٚ لە کاتی تەحیات بە شیٚوازی چوار مشقی یان هەردوو پیٚی بەرەو لای ڕاستی خۆیەوە دەردەهیٚنیٚت لە جیاتی ئەوەی بە شیٚوەی تەوەڕوك یان افتراش دابنیشیٚت چونکە ئەوە داپۆشراوترە بۆی.

تەوەڕوك واتا / ئەوەیە کە پیاو لە تەحیات پیٚی ڕاستی دەچەقیٚنیٚت بە ئەرز و پیٚی چەپیشی لە ژیٚر ڕانی ڕاستیەوە دەردەکاتە دەرەوە .

افتراش واتا / ئەوەیە کە پیٚی ڕاستی دەچەقیٚتە ئەرز و پیٚی چەپیشی لە ژیٚر سمتی چەپی پان دەکاتەوە و لەسەری دادەنیشیٚت .

**ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: ئیمامی شافعی فەرموویەتی : جیاوازی نیە لە نێوان پیاو و ژن لە نوێژ کردندا تەنها ئەوەنەبێ کە ئافرەت خۆی کۆدەکاتەوە و دەیلکێنێت بە خۆیەوە ئەوە بۆی باشترە و داپۆشراوترە بۆی لە کاتی ڕکوع وە هەموو نوێژەکان.**

**٤- نوێژی ئافرەت بە جەماعەت و یەکێك ببێ بە ئیمام خیلافی تێدایە هەندێکیان ڕێگەیان داوە و هێندێکیشیان ڕێگریان کردووە . چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە أم ورقە کرد کە قامەت بۆ ئەندامانی خێزانەکەی بکات . وە هەندێکیان ئەفەرموون کە سونەتە و هەندێکیشیان دەفەرموون کە بێزراوە واتا مەکروهە وە هەندێکیان دەفەرموون جائیزە بۆ نوێژی سونەت نەك فەرز بەڵام قسەی ڕاستی ئەوەیە کە سونەتە .ئافرەت لە کاتی خوێندنی قورئاندا ئەبێ بە دەنگ قورئان بخوێنێ بەڵام بە مەرجێ کەسی نامەحرەم گوێی لە دەنگی نەبێ.**

**٥- ڕێگەپێدراوە ئافرەت بڕواتە مزگەوت لەگەڵ پیاوان نوێژ بکات . بەڵام ماڵەکەی باشتر و خێرترە ئیمامی مسلم لە صەحیحەکەیدا ئەفەرموێ کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** ( لا تمنعوا إماء الله مساجد الله ).

**واتا : ئافرەتەکانتان ڕێگریان لێ مەکەن کە نەڕۆن بۆ مزگەوت ) لە شوێنێکی تریشدا دەفەرموێ:**( لا تمنعوا نساءكم المسجد وبيوتهن خير لهن) **ڕێگری لە ئافرەتەکانتان مەکەن نەیەن بۆ مزگەوت بەڵام ماڵەکانیان خێرترە بۆیان.**

**مانەوەیان لە ناو ماڵدا نوێژەکانیان بکەن باشترە بۆیان بەڵام ئەگەر هاتنە ناو مزگەوت بۆ نوێژ دەبێ ڕەچاوی ئەم مەرجانە بکات :-**

**أ - ئەبێ هەموو لاشەی داپۆشرابێ بە حجاب عائیشە ( ڕەزای خوای لێ بێ ) دەفەرموێ:** ( فينصرف النساء متلفعات بمروطهن مايعرفن من الغلس ).

**واتا : ئافرەتان نوێژیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ ئەڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە جل و بەرگێکی وایان لەبەر بوو خۆیان تیا ئەپێچایەوە وەکو لۆکە وابوو.**

**ب-بڕاتە دەرەوە بۆنی خۆشی بەکار نەهێنابێ: قال رسول الله (ﷺ):** ( لا تمنعوا إماء الله مساجد الله وليخرجن إذا خرجن تفلات ).

**ڕێگری لە ئافرەتەكانتان مەكەن كە نەیەن بۆ مزگەوت بەڵام كە هاتنە دەرەوە نابێ بۆنی خۆش بەكار بێنن.**

**أبی هريره دەفەرموێ ( ڕەزای خوای لێ بێ ) كە پێغەمبەری خوا فەرموويەتی:** (أيما امرأة أصابت بخورا فلا تشهد معنا العشاء الآخرة).

**واتا : هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بكات و عەتر و بخور لە خۆی بدا با ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێ.**

**لە فەرموودەیەكی تردا زينبی خێزانی ابن مسعود دەفەرموێ :** (إذا شهدت إحداكن العشاء الآخرة فلا تمس طيبا).

**واتا : ئەگەر هەر ئافرەتێك ئامادەی نوێژی مزگەوت بوو با خۆی بۆن خۆش نەكات .**

**ئيمامی شوكانی ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرموێ: چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ ناو مزگەوت بەڵگەن لەسەر ئەوەی دەبێتە هۆی فيتنە ئەگەر خۆی بۆن خۆش بكات ئافرەت مۆڵەت لە هاوسەری وەردەگرێ و ئەڕواتە ناو مزگەوت ئەگەر چوونيان نەبێتە مايەی فيتنە بەهۆی بۆنی خۆش و خۆڕازاندنەوە و ئاڵتون بەكارهێنان .**

**ج-نابێ خۆی بڕازێنێتەوە بە جل و بەرگ و ئاڵتون :**

**عائيشە (خوا لێی ڕازی بێ ) دەفەرموێ:** ( لو رأى رسول الله ﷺ من النساء ما نرى لمنعهن من المساجد كما منعت بنو إسرائيل نساءها ).

**واتا : گەر پێغەمبەر (ﷺ)ئافرەتی ئێستای ببينيایە ئەوا ڕێگری لێ دەكردن بێن بۆ مزگەوت وەكو چۆن بەنی ئيسرائيل ڕێگريان كرد لە ئافرەتەكانيان .**

**ئيمانی شوكانی دەفەرموێ: لەسەر قسەی عائيشە گەر بيبينيایە ئەوەی ئێمە بينيمان واتا لە جوانی و جل و بەرگ و بۆن و دانەپۆشراوی .. بەڵكو جاران ئافرەت دەردەچوون بۆ مزگەوت لە ناو المط ( جلێكە لە صوف يان كەتانە ئافرەت دەيدابە خۆيدا .**

**الاكسيه : جل و بەرگ**

**شملات : جل و بەرگێ هەموو جەستەی دادەپۆشێ**

**الغلاظ: دژی تەنکە واتا ئەستور بوو جلەکانیان**

**ئیمامی جوزی دەفەرموێ: ئەبێ ئافرەت ئاگادار بێ لە کاتی چوونە دەرەوە ئەگەر لە خۆشی سەلامەت بوو ترسی نەبوو ئەگەر خەڵکی لێی سەلامەت نیە ئەگەر زۆر پێویستی کرد بڕواتە دەرەوە بە پرسی مێردی دەبێ لە شوێنێ بڕوات کە چۆڵ بێ و کەس گوێی لە دەنگی نەبێ و لە قەراغی ڕێگەوە بڕوات نەك لە ناوەڕاستی ڕێگا.**

**د-ئەگەر ئافرەت بە تەنها بوو دەبێ لە دوای پیاوەوە بوەستێ بۆ نوێژ:**

**فەرموودەی أنس** رضي الله عنه **کاتێ نوێژی پێ کردن پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) **فەرمووی:** (فقام عليه رسول الله صلى الله عليه وسلم وصففت أنا واليتيم وراءه والعجوز من ورائنا).

**واتا: من و منداڵەکە لە دوای پێغەمبەرەوە وەستاین و ژنە پیرەکەش لە دوای ئێمەوە.**

**وە** (صففت أنا ويتيم في بيتنا خلف النبي صلى الله عليه وسلم وأمي أم سليم خلفنا ) **واتا: من و منداڵەکە لە دوای پێغەمبەرەوە وەستاین و دایکیشم لە دوامانەوە.**

**ئەگەر ئافرەت زیاتر بوون ئەبێ لە دوا پیاوان بوەستن چونکە پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **پیاوانی پێش دەکرد دوایش کوڕی هەرزەکار دوای ئەوانیش ئافرەتان.**

**ئیمامی احمد لە أبو هريره فەرموویەتی کە پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی:**(خير صفوف الرجال أولها وشرها آخرها وخير صفوف النساء آخرها وشرها أولها).

**واتا : باشترین ڕیزی پیاوان ڕیزی پێشەوەیە لە نوێژدا خراپترینیان ڕیزی دواوەیە باشترین ڕیز بۆ ئافرەتان لە نوێژدا ڕیزی کۆتاییە خراپترینیشیان ڕیزی پێشەوەیانە.**

**ئەو دوو فەرموودە بەڵگەن ئەبێ ئافرەت لە دوای پیاوان نوێژ بکەن نابێ بە جیا جیا نوێژ بکەن ئەگەر نوێژەکە فەرز بوو یان سونەت.**

**ه – ئەگەر ئیمام لە نوێژدا غەڵەتی کرد یان شتێکی بیر چوو ژنان بە دەستی ڕاست ئەکێشن بە دەستی چە پیان :**

**پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **دەفەرموێ: ( اذا انابكم فشيء في صلاتكم فلتسبح الجال، ولتصفق النساء)،**

واتا : ئەگەر ئیمام لە نوێژدا بیری چووەوە ژنان دەبێ بە دەستی ڕاست دەكێشن بە چەپدا وەك چەپڵە پیاوانیش ئەڵێن (سبحان الله ).

چونكە دەنگی ئافرەت فیتنەیە بۆ پیاوان بۆیە لەو كاتەدا فەرمانیان پێ كراوە بە چەپڵە لێدان و قسە نەكەن .

و- ئەگەر ئیمام سەلامی دایەوە لە نوێژ ئافرەت دەبێ زوتر بچنە دەرەوە وە پیاوانیش دانیشن.

أم سلمه دەفەرموێ: ( ئافرەتان كە سلاّوی نوێژیان بدایەتەوە هەڵئەستان و دوایش پیاوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا هەڵئەستان و مزگەوتیان بەجێ ئەهێشت.

ئیمامی زهری دەفەرموێ: بۆ ئەوەیە كە ژنان بڕۆنە دەرەوە لە كاتی نوێژ تەواو بوون.

ئیمامی شوكانی دەفەرموێ: ئەو فەرمودەیە ئەوەیە كە سونەتە ئیمام حاڵی نوێژ خوێنان بزانێ و وە دووركەونەوە لە تێكەلاّوی لەگەڵ ئافرەتان لە ڕێگاكان.

**ئیمامی نەووی دەفەرموێ: ئافرەت لەگەڵ پیاوان چەند جیاوازیەكیان هەیە لە نوێژی جەماعەت :**

□- لەسەریان واجب نیە وەك لەسەر پیاو تەئكید كراوە .

٢- ئیمام لە ناوەڕاستیان ئەوەستێ.

٣- ئافرەت لە دوای پیاو ئەوەستێ نە لە تەنیشتی بە پێچەوانەی پیاو .

٤- ئەگەر لەگەڵ پیاوان نوێژی كرد باشترین ڕیز ڕیزی دواوەیە .

ز- چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ نوێژی جەژن:

ام عطیه دەفەرموێت: ( أمرنا بأبي وأمي رسول الله ﷺ أن نخرجهن يوم الفطر ويوم النحر العواتق وذوات الخدور والحيض فأما الحيض فيعتزلن المصلى ويشهدن الخير ودعوة المسلمين ).

واتا: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێكردین كە لە ناو نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان كە ئافرەتانی كەنیزەك و حەیزدار و ئەو ئافرەتانەی كە گەنجن و لە ماڵدا لە شوێنی تایبەت دەمێننەوە بەلاّم ئەوانەی لە حەیزدان نوێژ ناكەن . لە شوێنێكی تر دەفەرموێ واتا لە موصەلا ئەمێنن و دوعای خێر دەكەن.

**ئیمامی شوکانی دەفەرموێ: واتای فەرموودەکە ئەوەیە کە شەرعیە ئافرەتی گەنج و پیر و حەیزدار بێنە دەرەوە ئەو دوو نوێژە بکەن .**

**شێخی ئیسلام دەفەرموێ: ئافرەتی ئیماندار نوێژەکەی لە ماڵی خۆیدا باشترە لە مزگەوت بۆ نوێژی جومعە و جەماعەت بێجگە لە نوێژی دوو جەژنەکە چونکە فەرمانی پێکراوە کە بێت بۆ ئەو نوێژە.**

**لەبەر چەند هۆکارێك:**

**١- لە ساڵێکدا دوو جارە بە پێچەوانەی جومعە و جەماعەت .**

**٢- نوێژی تر ناچێتە بری ئەو دوو نوێژە بە پێچەوانەی جومعە و جەماعەتەوە نوێژی نیوەڕۆی بە نوێژی جومعەیە.**

**٣- چوونەدەرەوە بۆ ئەو نوێژە کە یادی خوای گەورە دەکات لە حەج ئەکات لەو ڕووەوە چونکە جەژن گەورەترین وەرزی حەجە چونکە وەك حاجیەکان وایە.**

**وە ئیمامی شافعی بە پێویستی کردووە کە چوونە دەرەوە بۆ نوێژی جەژن بەڵام ترسی فیتنەیان نەبێ بەڵام ئەگەر ترسی هەبوو نابێ بڕوات .**

**ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: ئیمام شافعی و هاوەڵانی ( رحمهم الله ) موستەحەبە ئەو ئافرەتانەی کە ترسی فیتنەیان نیە ئامادەی نوێژی جەژن بن بەڵام ئەگەر ترسیان هەبوو نابێ ئامادەبن ئەگەر چوونە دەرەوە سونەتە بە جل و بەرگی داپۆشراو جلی شوهرە و بەناوبانگیان لەبەر نەبێ ئەبێ خۆیان بشۆن و خۆیان بۆن خۆش نەکەن ئەو حوکمە بۆ ئافرەتێکە کە نەبێتە جێی سەیر کردنی خەڵکی بەڵام ئافرەتی گەنج ئەوانەی جێی سەیر کردنی خەڵکیە نابێ ئامادەبن و کەراهەتی هەیە لە ترسی فیتنە ئەگەر وتیان ئەو قسەیە پێچەوانەی فەرموودەکەی أم عطیەیە ئێمەش ئەڵێین فەرموودەکەی عائیشە کە فەرمووی :** (لو أدرك رسول الله ﷺ ما أحدث النساء لمنعهن المساجد كما منعه نساء بني إسرائيل).

**چونکە فیتنە لەم سەردەمەدا زیاتر و بەربڵاوترە لە چاو سەردەمی ئەوان .**

**ـ منیش دەڵێم : لەم سەردەمەدا زیاترە ـ .**

**ئیمام ابن جوزی دەفەرموێ: ئاشکرامان کرد کە ئافرەت بڕواتە دەرەوە ڕێگە پێدراوە بەڵام ئەگەر ترسی فیتنەی هەبووە ڕێگری چوونە دەرەوەی لێ بکرێ باشترە چونکە ئافرەتانی ئەو سەردەمە وەك هی ئەو سەردەمە نیە وە هەروەها پیاوەکانیش .**

**ئەم وتانە دەزانی کە خوشکی موسڵمان چونە دەرەوەت بۆ نوێژی جەژن ڕێگە پێدراوە بە مەرجی ی خۆ داپۆشین و التزام بە جل و بەرگی شەرعیەوە وە بە نیەتی نزیك بوونەوە لە خوای گەورە وە بەشداری بکەی لە دوعای موسڵمانان و ئاشکردا کردنی دروشمی ئیسلام.**

**وە مەبەست بە دەرخستنی جوانی و بێتە جێگای فیتنە بۆیە ئاگاداری ئەوە بە.**

## ( بەشی شەشەم )

## أحكام تختص بالمرأة في باب أحكام الجنائز

## چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەتان لە ئامادەکردنی مردوو

**خوای گەورە مردنی لەسەر هەموو نەفسێك نوسیووە و هەر خۆی بە تەنیا دەمێنێتەوە لە سورەتی رحمن دەفەرمـوێ: [ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ (٢٧) ]** الرحمن.

**واتە: تەنها زاتی پیرۆزی الله ی تۆ دەمێنێتەوە کە خوایە کە خاوەنی گەورەیی و پیرۆزی و ڕێزە و شایەتی ئەوەیە کە بە گەورە و بەڕێز بزانرێ و گوێڕایەڵی بکرێ و سەرپێچی نەکرێ).**

**کە مردوویەك مرد دەبێ زیندووەکان جێ بەجێی بکەن . ئێمە لەم بەشە باسی چەند حوکمێکی تایبەت ئەکەین بە ئافرەتان :**

**- واجبە ئافرەت کە مرد ئافرەت بیشوات. نابێ پیاوان بیشۆن بەڵام مێرد ئەتوانێ خێزانی بشوات وە پیاوان پیاو بشوات نابێ ژن بشوات مەگەر ژن مێردی بشوات لەبەر ئەوەی عەلی رضي الله عنه فاطمە ی خێزانی شۆرد، وە أسماء بنت عميس هاوسەری أبوبکری صدیق بوو شۆردی ( ڕەزای خوا لە هەموویان ).**

**٢- سونەتە ئافرەت لە پێنج پارچە کفن بکرێ. شەرواڵی لە پێ بکرێ وە سەرپۆشێ بۆ سەری و کراسی لەبەر بکرێ وە دوو پارچە پێی بپێچرێ لەسەر ئەو جلانەوە .**

**لیلى الثقفي دەفەرموێ : ( من أم كلثوم شۆرد لە کاتی وەفاتیدا یەکەم شت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی داین کراسێ بوو ئنجا سەرپۆش ئنجا شتێ کە تێوەی بپێچین . دوای ئەوەش پارچەیەکی تر لەسەر ئەو جلانەوە .**

**(الحقى : واتا شەرواڵ).**

**ئیمامی شوکانی دەفەرموێ : ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کە کفنی ئافرەت شەرواڵ و کراس و لەچك و دوو پارچە قوماشە تێوەی بپێچرێ.**

**٣-قژی ئافرەت چی لێبکرێ : ئەگەر درێژ بوو بکرێ بە سێ بە شەوە هەمووی کۆبکرێتەوە و ببرێ بۆ بەشی دواوە هەڵدانەوە . فەرموودەکەی أم عطیە باسی شۆردنی کچی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات دەفەرموێ کردمان بە سێ بەشەوە و بەسەر پاشە سەریدا هەڵمان دانەوە.**

**٤- شوێنکەوتنی ئافرەت لەگەڵ جەنازە :**

**أم عطیە دەفەرموێ ( ڕێگریمان لێ کرا شوێن جەنازە بکەوین) .**

(نهينا عن اتباع الجنائز ، ولم يعزم علينا)

**دەقەکە زاهیرەن حەرامە بەڵام وتنی ( ولم یعزم علینا ) شێخی ئیسلام دەفەرموێ ـ مەبەستی ئەوەیە ـ کە تەئکیدی لەسەر نەکراوەتەوە کە ڕێگری بکرێ.**

**٥-سەردانی گۆڕەستان بۆ ئافرەتان حەرامە :**

**أبی هریرە** رضي الله عنه: (لعن الله زوارات القبور).

**واتا : لەعنەتی خوا بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە سەردانی گۆڕستان دەکەن .**

**شێخی ئیسلام دەفەرموێ: ـ وەك زانراوە ئافرەت کە دەرگای ئەوەی لێ کرایەوە کە لە خۆی بدات و هاوار و قیژە بکات . ئەوە نیشانەی کەم ئارامیەتی وە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مردووەکە ئازار بدرێ بەو گریانە وە پیاویش بەو جۆرە ببینێ کە دەنگی و وێنەی ببینێ لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە :** (فإنكن تفتن الحي وتؤذين الميت). **(واتا ئێوە دەرگای فیتنە دەکەنەوە و ئازاری مردوو ئەدەن .**

**ئەگەر سەردانی کردنی ئافرەتان بۆ گۆڕستان هۆکار بێ کاری حەرام لە حەقیانا و حەقی پیاوانیش..**

**حیکمەت لێرەدا ڕێك نیە چونکە ناتوانی ماوەی دیاری کراو دابنێی بۆت جیاناکرێتەوە لە جۆرێ بۆ جۆرێکی تر..**

**لە بنچینەی شەرعدا حکمەت لەوەدایە ئەگەر شاراوەبێ یان بڵاو نەبێ ئەوا حەرامە ئەو ڕێگەیە وەك چۆن حەرامە سەیری جوانی ناوەڕۆك بکەی وەك چۆن حەرامە خەڵوە**

لەگەڵ كەسێكی بێگانە بەرژەوەندی لەوەدايە تەنها دوعا بۆ مردووەكە بكات ئەتوانێ لە ناو ماڵی خۆی ئەو دوعايە بكات .

**٦- حەرامە دەنگ بەرز كردنەوە :**

ئەوەيە كە دەنگ بەرز بكرێتەوە جل بدرێنی و لە رومەتی خۆت بدەی وە قژت ڕاكێشی وە دەم و چاوت ڕەش بكەی لەبەر مردووەكە وە دوعا بكەی بە وەيل و ئەبێتە ئەوەی قەزا و قەدەری خوای گەورە وەك ناشكوريەك و صبرت نەمێنێ حەرامە بە هەموو جۆرەكانی تاوانێكی گەورەيە.

لە صەحيحدا هاتووە: ( بَرِئَ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ ).

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی : ( لە ئێمە نيە كەسێ لە ڕومەتی خۆی بدات و جلكەكانی بدڕێنێ و هاوار بكات وەك كەسانی جاهل) لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ( من لەم سێ كەسە بەريم كەسێ لەسەر مردوويەك هاوار و دەنگ بەرزكاتەوە سەری بتاشێ و جلەكانی بدڕێنێ لە بەريدا ).

الصالقە : ئەوەی دەنگ بەرز دەكاتەوە لە كاتی موسيبەت .

الحالقە : ئەو كەسەی سەری دەتاشێ.

الشاقة : ئەوەی جلەكەی لەبەری خۆيدا دەدڕێنێ.

لە صەحيحی موسليمدا هاتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی : (لعن رسول الله ﷺ النائحة ، والمستمعة) واتا : ( لە ڕەحمەتی خوا دەرچووە ئەو كەسەی كە ئەلاوێنێتەوە بۆ مردووەكە و ئەوەشی گوێی لێ ئەگرێ و حەزی لێيە) .

خوشكی موسڵمان واجبە لەسەر تۆ واز لەو كارانە بهێنی كە حەرامن لە كاتی موسيبەتدا وە ئارام بگرە و داوای پاداشت لە الله بكە ئەگەر موسيبەتەكە لەسەر حەقی خۆت بێ دەبێتە هۆی سڕينەوەی تاوانەكانت وە چاكەت زياد دەكات.

خوای گەورە دەفەرموێ: [ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ

رَاجِعونَ (١٥٦) أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ (١٥٧) ] البقرة.

**واته: به تهئكيد ئێمه ئێوه تاقی دهكهینهوه به ههندیٚ ترس و بیم و برسێتی و فهوتاندنی ماڵ و سامان و له دهستدانی كوڕ و كچ و خزم و خۆشهویست و بهروبوم و میوهجات ، موژده بهوانه بده له بهرامبهر ئهم بهڵا و كارهساتانهدا به صهبر و ئارام و خۆڕاگرن ئهوانهی كه بهڵا و كارهساتیان توش بوو دهڵێن ، ئێمه ههموومان هی خواین و بۆ بهر قاپی ڕهحمهتی ئهو دهگهڕێینهوه ئهوانه لهلایهن پهروهردگاری خۆیانهوه ڕهحمهت و فهڕ و بهخشش ههیه بۆیان و ههر ئهوانه هیدایهتدراو و سهرفرازن.**

**بهڵیٚ جائزه گریان لهسهر مردوو بهڵام دهنگ بهرز كردنهوهی لهگهڵ نهبیٚ و كار و كردهوهی حهرامی تێدا نهوتریٚ وه خوای گهوره توڕه مهكهن چونكه ئهوه قهزا و قهدهره وه گریان ڕهحمهته بۆ مردووهكه و دڵ نهرمیه ئهوه كارێكی سونهته ... والله المستعان.**

## ( بەشی حەوتەم )

## ( أحكام تختص بالمرأة في باب الصيام )

## چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەت دەربارەی ڕۆژوو

بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی نێر و مێ یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام خوای گەورە دەفەرموێ: [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣) ] البقرة.

واتا: ئەی باوەڕداران ئێوە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانتان لەسەر فەرز کراوە .

هەرکاتێ ئافرەت گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون و نیشانەیەکی لێ دەرکەوت لەوانە حەیز لەو کاتەدا واجبە بە ڕۆژوو بێ هەندێ لە تەمەنی نۆساڵیدا تووشی ئەو حاڵەتە ئەبێ وە هەندێ لە ئافرەت ناهێڵن لەو تەمەنە بە ڕۆژوو بێ بە بیانوی ئەوەی کە مناڵە ئەوە کارێکی خراپە کە واز لە ڕوکنێکی گەورەی ئیسلام دێنێ وە هەر کاتێ سوڕی مانگانەی بەسەر هات و بە ڕۆژوو نەبوو ئەبێ ڕۆژوەکانی قەزا بکاتەوە ئەگەر ماوەیەکی زۆریشی بەسەردا تێپەڕیبوو چونکە هەر لە گەردنی ماوە . واجبە لەسەری لەگەڵ گرتنەوەی هەر ڕۆژویەك خواردنی ڕۆژێکی فەقیریش بدات .

### کێ ڕۆژووی لەسەر واجبە ؟:

کە مانگی ڕەمەزان هات واجبە هەموو موسڵمانێکی نێر و مێی باڵغ لەش ساغ لە وڵاتی خۆیان بن بە ڕۆژوو بن . وە هەر کەسێ نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو لەو مانگەدا بە ڕۆژوو نەبێ و ڕۆژانی دوایی قەزای بکاتەوە .

قال الله تعالى: [ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ] البقرة.

واتە: هەرکەسێ لەو مانگەدا ئامادە بوو لە شاری خۆی بوو موقیم بوو ئەوا با بە ڕۆژوو بێ ، بەڵام کەسێك کە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو ، ئەوە دەتوانێ لە دوای ڕەمەزان لە چەند ڕۆژێکدا ڕۆژوەکانی بە قەزا بگێڕێتەوە.

هەرکەسێك تەمەنی گەورە بوو یان نەخۆشیەکی درێژخایەنی هەبوو هیوای چاك بونەوەی نەبوو لە ژنان و پیاوان نابێ بە ڕۆژوو بێ لە بری هەر ڕۆژویەك خواردنی فەقیرێ بدەن بە پێی خواردنی ئەو شار و ولاتە .

[ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن ]

واتا : ئەو کەسانەی کە ڕۆژوو قورسە لەسەریان توانایان نیە لە پیرێژن و پیرەمێرد ئەوە فدیە ئەدەن لە بری هەر ڕۆژێ خواردنی فەقیرێ.

عبدالله ی کوڕی عباس ( ڕەزای خوایان لێ بێ ) دەفەرموێ: ئەوە بۆ کەسێکە کە تەمەنی گەورەیە لە نەخۆشیەکەی چاك نابێتەوە وە کەسێك کە نەخۆشە بەلاّم چاك نابێتەوە لەو نەخۆشیەی هەمان حوکمی گەورەکەی هەیە . ڕۆژوو قەزا ناکەنەوە.

ئافرەت چەند عوزرێکی هەیە لەو مانگەدا بەهۆیەوە ڕۆژوو ناگرێ بەلاّم لە ڕۆژانی دواتر دەبێ ڕۆژوەکە قەزا بکاتەوە:

لەوانە :

□-**حەیز و خوێنی زەیستانی** : حەرامە ئافرەت بە ڕۆژوو بێ دەبێ ڕۆژوەکانی قەزا بکاتەوە لە صحیحن دا هاتووە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: (فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ ، وَلا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاةِ).

واتا : ئێمە فەرمانمان پێ دەکرا کە ڕۆژوەکانمان قەزا بکەینەوە وە فەرمانمان پێ نە دەکرا کە نوێژەکان قەزا بکەینەوە .

حکمەتی چیە ؟ شێخی ئیسلام ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) دەفەرموێ: ئەو خوێنەی بەهۆی سوڕی مانگانەوە دێن ـ ئافرەتی حەیزدار دەتوانێ لەو کاتانەی کە پاکە ڕۆژوەکانی بگرێتەوە . ڕۆژوو گرتن لە کاتی پاکێتیدا لاشەی بەهێز دەکات بەوە ڕۆژوو گرتن لە کاتی سوڕی مانگانە دەبێت ئەو خوێنە بێتە دەرەوە کە مادەیەکە ئەبێتە نوقسانیەك لە لاشەی و لاوازی دەکات بۆیە فەرمانی پێ کراوە کە ڕۆژوو نەگرێ لەو کاتەدا.

**٢- دوو گیانی و شیردان :**

**هەردووکیان دەبێتە زەرەر بۆ ئەو ئافرەتە یان بۆ منالەکەی یان بۆ دایك و منداڵەکە ـ دەتوانێ لە کاتی دوو گیانی و شیردانە بە ڕۆژوو نەبێ ، ئەگەر زەرەری لێ بدات لە منداڵەکە کە ڕۆژوو نەگرێ ئەبێ هەر ڕۆژەی خواردنی فەقیرێ بدات وە ئەگەر زەرەری بۆ ئافرەت هەبوو ئەتوانێ ڕۆژوەکانی قەزا بکاتەوە چونکە هەردوو حوکمەکە بۆ دووگیان و شیردەرە. خوای گەورە دەفەرموێ:** [ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن ] البقرة.

**حافزی أبن كثير دەفەرموێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا : واتە ئەگەر دوو گیان و شیردەر ترسی ئەوەیان هەبوو لە خۆیان و لە منداڵەکەیان .**

**شێخی ئیسلام دەفەرموێ: ئەگەر ئافرەت ترسا لەو منداڵەی لە سکیدایە نابێ ڕۆژوو بگرێ لە بری دەبێ ڕۆژەوەکەی قەزا بکاتەوە و خواردنی فەقیرێ بدات .**

**ئاگاداری /**

**□– ئافرەتی مستحاضة ( واتا خوێنی نەخۆشی ): ئەو خوێنەیە لە خوێنی حەیز ناچێ دەبێ بە ڕۆژوو بێ نابێ وازی لێ بێنێ لە پێناو أستحتاضة.**

**شێخی ئیسلام دەفەرموێ: کە ئافرەتی حەیزدار بە پێچەوانەی مستحاضة دەفەرموێ ( ئافرەتی مستحاضة کاتەکانی دیاری کراو نیە کە ببێتە هۆی ئەوەی ڕۆژوو نەگرێ وە نابێ واز بێنێ لێی وەك ئەوە وایە کە کەسێك بڕشێتەوە یان خوێن لە شوێنێ بێ بەهۆی برینەکەوە یان ئیحتلام بێ چونکە ئەم حاڵەتانە کاتی دیاری کراویان نیە و نابێ واز لە ڕۆژوەکانی بێنێ ئەوانە نابێتە ڕێگر کە ڕۆژوو نەگرێ بە پێچەوانەی خوێنی حەیز.**

**٢– واجبە لەسەر ئافرەتی حەیزدار وە دوو گیان و شیردەر ئەگەر ڕۆژویان نەگرت لە نێوان هەردوو ڕەمەزان و ڕەمەزانێکی تر ڕۆژوەکەیان قەزابکەنەوە.. وە دەست پێشخەری بکەن ئەگەر نەیانگرنەوە و عوزریان نەبوو ئەوە ئەبێ قەزای بکەنەوە و بۆ هەر ڕۆژێ خواردنی فەقیرێ بدەن . وە ئەگەر عوزریان هەبووە ئەوە تەنها ڕۆژوەکە**

قەزا دەکەنەوە ، وە هەرکەسێ ڕۆژوو قەرزی لابێ بە هۆکاری نەخۆشی یان سەفەرکردن حوکمی ئەوەی هەیە کە لە حەیزدا ڕۆژوی نەگرتبێ ئەبێ قەزای بکاتەوە.

٣- **ئافرەت نابێ ڕۆژوی سونەت بگرێ بە بێ ئیزنی مێردی** : بوخاری و مسلم لە أبی هریرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( لا يحل لامرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه ).

واتا: ( ئافرەت نابێ ڕۆژووی سونەت بە ڕۆژوو بێ وە بێ ئیزی مێردی ) لە ڕیوایەتێکی تردا تەنها ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان نەبێ.

ئەگەر مێردی ڕێگەی دا ڕۆژوی سونەت بە ڕۆژوو بێ ئەگەر هاوسەری لای نەبوو یان هاوسەری نەبوو سونەتە ڕۆژوەکان بە ڕۆژوو بێ وەك ڕۆژوی ڕۆژی دوو شەممە و پێنج شەممە وە سێ ڕۆژ لە مانگێکدا وە شەش ڕۆژ لە ڕۆژی مانگی شەوال وە دە ڕۆژی ذي الحجة و ڕۆژوی عەرەفە و ڕۆژوی عاشورا ڕۆژێ لە پێشی یان لە دوای وە نابێ لە ڕۆژوەی سونەت بە ڕۆژو بێ تا قەرزی مانگی ڕەمەزان تەواو دەبێ.

٤- ئەگەر ئافرەت پاك بۆوە لە ڕۆژدا کە ڕەمەزان بوو ئەو ڕۆژەش قەزا بکاتەوە.

## ( بەشی هەشتەم )

## أحكام تختص بالمرأة في الحج و العمره

## چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەت لە کاتی حەج و عومرە

حەج کردن بۆ ماڵی خودا لە هەموو ساڵێکدا لەسەر ئوممەتی ئیسلامە واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەگەر مەرجەکانی بۆ جێبەجێ بکرێ و دەبێ لە هەموو تەمەنیدا یەك جار بڕوات و ئەگەر زیادیشی کرد ئەوە سونەتە حەج یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام بەشی ئافرەتی موسڵمانە لە جیهاد کردن وەك فەرموودەی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ ) دەفەرموێ: (يا رسول الله هل على النساء جهاد قال نعم جهاد لا قتال فيه الحج والعمرة). وللبخاری : (قالت قلنا : يا رسول الله نرى الجهاد أفضل العمل أفلا نجاهد معك قال لا ولكن أفضل الجهاد حج مبرور).

واتا : ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئافرەت جیهاد کردن هەیە؟ فەرمووی : بەڵێ جیهادی ئافرەت کە شەڕی تێدا نیە . حەج و عومرەیە).

لە فەرموودەیەکی تردا ( ئەی پێغەمبەری خوا جیهاد باشترین کردەوەیە ئێمەش جیهاد ناکەین ؟ فەرمووی : باشترین جیهاد بۆ ئافرەت حەجێکی قبولْ کراوە.

**لە حەج چەند حوکمێکی تایبەت بە ئافرەت :**

**١- المحرم :- مەحرەم**

حەج چەند مەرجێکی گشتی هەیە بۆ پیاو و ئافرەت لەوانە موسڵمان بێ ئاقڵ بێ ئازاد بێ باڵغ بێ توانای مادی هەبێ تایبەتمەندی ئافرەت ئەبێ محرمی لەگەڵ بێ کە سەفەری حەجی کرد مێردی یان کەسێك کە مەحرەمی بێ وەك باوکی یان کوڕی یان برای یان بە ڕێگەیەك کە ڕێپێدراو بێ وەك برای شیری یان مێردی دایکی یان کوڕی مێردی .

بە بەڵگەی فەرموودەی أبن عباس ( ڕەزای خوایان لێ بێ ) گوێی لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) کە لە خوتبەدا فەرموویەتی : (لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بامرأةٍ ، وَلا تُسَافِرُ امْرَأَةٌ إلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ).

واتا :با پیاویٚ لەگەڵ ژنێکدا نەبیٚ بە تەنها لەگەڵ مەحرەمی خۆی نەبیٚ وە ئافرەتیش بە تەنها سەفەر نەکات بە بیٚ مەحرەمی خۆی ) پیاوێکیش هەستا وتی یارسول الله من خێزانم چووە بۆ حەج منیش ناوی خۆم نوسیوە بۆ غەزا واتا بۆ جەنگ ئەویش فەرمووی : ( انطلق فحج مع امرأتك ) .

فەرمووی خێرا بڕۆ حەج لەگەڵ خێزانەکەت بکە وە عبدالله کوڕی عەمر دەفەرمویٚ کە پێغەمبەر فەرموویەتی (لا تسافر المرأة ثلاثا إلا ومعها ذو محرم) واتا: ئافرەت نابیٚ سیٚ ڕۆژ لە شوێنێکدا بمێنێتەوە بە تەنها ئیلا دەبیٚ مەحرەمی لەگەڵ بیٚ.

فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرە کە ڕێگری دەکات لە سەفەر کردن بۆ حەج و غەیری حەجیش. چونکە ئافرەت لاوازە توشی هیلاکی دەبیٚ لە سەفەردا ناتوانیٚ ڕوو بەڕووی بێتەوە پیاوی لەگەڵ نەبیٚ وە دەبێتە جێگەی چاو تێبڕینی کەسانی فاسق پێویستی بە مەحرەمێکە کە بیپارێزیٚ.

وە مەرجە کە محرەمی ئافرەتەکە عاقڵ بیٚ و باڵغ بیٚ و موسڵمان بیٚ چونکە کەسی بیٚ باوەڕ ئەمین نیە ئەگەر مەحرەمی نەبوو ئەبیٚ کەسیٚ حەجی بۆ بکات.

**٢- ئەگەر حەجەکە سونەت بوو ئەبیٚ ئیزنی مێردی وەربگریٚ.**

پیاو دەتوانیٚ ڕێگری لە خێزانی بکات لە حەجی سونەتدا .

ئبن منذر دەفەرمویٚ: ڕای زانایانی عیلم ئەوەیە کە ڕێگری بکات لەو حەجە چونکە مافی مێردەکەیەتی ئەبیٚ بە گوێی بکات وەکو چۆن خزمەتکار لەبەردەمی گەورەکەیا.

**٣-دروستە ئافرەت لە جێگای پیاو حەج و عومرەی بۆ بکات :**

شێخی ئیسلام دەفەرمویٚ: جائزە ئافرەت حەج بۆ ئافرەتێکی تر بکات بە کۆی دەنگی زانایان ئەگەر کچ بیٚ و هەر ئافرەتێکی تر بیٚ ئافرەتیش دەتوانیٚ حەج بۆ پیاو بکات لای هەر چوار مەزهەبەکە و کۆی زانایان .

فەرمانی کرد پێغەمبەر (ﷺ) بە ئافرەتێکدا کە حەجی بۆ باوکی کرد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا واجب بوونی حەج بۆ بەندەکانی الله یە باوکیشم پیاوێکی پیرە و بە تەمەنە . فەرمانی کرد کە حەج بۆ باوکی بکات.

**٤-ئەگەر ئافرەت لە ڕێگادا بوو بۆ حەج حەیز و نیفاسی بەسەر هات ئەبێ بەردەوام بێ لە چوون:**

ئەگەر لە کاتی ئیحرامدا بوو ئەبێ ئیحرام ببەستێ وەك ئافرەتە پاکەکانی تر چونکە ئیحرام بەستن مەرج نیە لەسەر پاکێتی.

لە ( مغنی) دەڵێ: خۆشۆردن بۆ ئافرەتان لە کاتی ئیحرام بەستن لە شەرعدا هاتووە بۆ پیاوانیش چونکە حەج کردن لە حەقی حەیز و نیفاسیشدایە چەند هەواڵێ لەو بارەیەوە هاتووە کە جابر فەرموویەتی گەیشنە ذوالحلیفة اسماءکچی عمیس محمد بن أبی بکر لە دایك بوو ، جوابیان نارد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چیبکات ؟ فەرمووی : خۆت بشۆ کۆپەوانەیەك بخەرە سەر ئەو شوێنەی خوێنی لێ دێ بە پەڕۆیەکی پان لە پێشەوە لە دواوە شەتەکی بە نیەت بێنە و أحرام ببەستە.

(اغتسلي واستذفري بثوب واحرمي)

عبداللە ی کوڕی عباس لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێ: (إن الحائض والنفساء يقضيان المناسك كلها غير الطواف بالبيت) .

واتا : ( ئافرەتی زەیستان و حەیزدار ئەگەر لە کاتی ئیحرامدا بوون هەموو واجبەکان دەکەن تەنها تەواف کردن نەبێ) .

فەرمانی کرد پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عائیشە وتی خۆت بشۆ بۆ حەج کە لە حەیزدا بوو . حیکمەتی ئەو خۆشۆردنە بۆ ئافرەتی حەیزدار و زەیستان ئەوەیە کە پاك ئەبن و ئەو بۆنە ناخۆشە نامێنێ ئازاری موسڵمان نادات لە کاتی کۆبوونەوە وە زەرەری نابێ لەسەر ئیحرامەکەیان بەو جۆرە ئەمێننەوە کە ئیحرامیان بەستووە وە دوورکەونەوە لە زەرەر و زیانێ لە کاتی ئیحرام وە تەواف نەکەن بە دەوری ماڵی خوادا هەتا پاك دەبنەوە و خۆیان دەشۆن ئەگەر ڕۆژی عەرەفە هات پاك نەبوونەوە ئیحرامیان بەستووە بۆ عومرە بە تەمەتوع بۆ حەج ئەوە ئیحرام دەبەستن بە نیەتی حەج دەچنە ناو عومرەوە بە قەرن واتا هەردووکی بەڵگەی فەرموودەی عائیشە ( ڕەزی خوای لێ بێ ) کەوتە حەیزەوە ئیحرامی بەست بوو بۆ عومرە کە پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لای

ئەگریا پێی فەرموو : بۆ دەگری لە حەیزدای ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەویش فەرمووی : ئەوە حاڵەتێکە کە خوای گەورە لەسەر کچانی نەوەی ئادەم نوسیویەتی حاجی چی کرد تۆش ئەوە بکە بەڵام تەواف مەکە بە دەوری ماڵی خوادا .

وە فەرموودەکەی جابر پێغەمبەر (ﷺ) عائیشەی بینی دەگریا فەرمووی چیتە فەرمووی ئەوەمە کەوتومەتە حەیزەوە خەڵکی دەڕۆن بۆ حەج و تەواف دەکەن من ناتوانم فەرمووی : ( ئەوە فەرمانێکە کە خوای گەورە لەسەر کچانی ئادەم نوسیویەتی خۆت بشۆ و بڕۆ حەج بکە . منیش وام کرد لە موقف وەستام لە عەرەفە ئەگەر پاك بویتەوە تەوافی کەعبە بکە و چوون بۆ کێوی صەفا و مەڕوە پاشان فەرمووی و عومرەکەت بە یەکەوە حەڵاڵ و دروستە کە ئیحرام دابنرێ واتا حەڵاڵت کردووە .

ئبن قەیم دەفەرموێ: فەرموودە ڕاستەکان ئاوایە کە لە پێشدا عومرە بکرێ و دوای حەج پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ عائیشەی بینی کەوتە حەیزەوە فەرمووی واز لە حەجی تمتع بێنە بەوەش حەجەکەی بوو بە قران واتە عومرە و حەجەکەی بوون بە یەك .

بۆیە فەرمووی : (يكفيك طوافك الأول بين الصفا والمروة للحج والعمرة).

واتا : بەستە کە تەواف بکەین بە دەوری ماڵی خوادا و لە بەینی کێوی صەفا و مەروە بۆ حەج و عومرەکەت .

**٥-ئافرەت چی دەکات لە کاتی ئیحرام بەستن :**

پیاو چی دەکات لە کاتی ئیحرام ئافرەتیش هەروا لە خۆشۆردن و خۆپاك کردنەوە کە پێویست بێ لە قژی بگرێ و نینۆکی و بۆنی ناخۆش چونکە لە کاتی ئیحرامدا ئەو کارانە قەدەغەیە ئەگەر پێویستی بەو شتانە بوو هیچیان نەکات چونکە ئەوانە تایبەت نین بە ئیحرامەوە هیچی تیا نیە کە لاشەی پاك بکاتەوە و بۆنی لێ بدات بە مەرجێ بۆنەکەی نەڕوات بە فەرموودەکەی عائیشە (كنا نخرج مع النبي ﷺ إلى مكة

فنضمد جباهنا بالسك المطيب عند الإحرام فإذا عرقت إحدانا سأل على وجهها فيراه النبي ﷺ فلا ينهانا)

واتا : لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بوین لە کاتی حەجدا ناوچەوانمان دەپێچایەوە بە مسك یان بە پارچە قوماشێکی مسکاوی ئەگەر عارەقەمان بکردایەتەوە ئەمان هێنا بە دەم و چاوماندا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لیٚ نەکردین .

ئیمامی شوکانی دەفەرموێ: بیٚ دەنگ بوونی بەڵگەیە لەسەر ڕێگە پێدانی چونکە لەسەر شتی پوچەڵ بیٚ دەنگ نابیٚ.

**٦- لە کاتی نیەت هێنان بۆ ئیحرام نیقاب و برقع دادەنریٚ:**

برقع : قیناعە دەم و چاو دادەپۆشیٚ.

ئەگەر لە پێش ئیحرام بەکاری هێنابوو کە جۆرێکە دەم و چاو دادەپۆشیٚ و هەردوو چاوی دادەپۆشیٚ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ولا تنتقب المرأة المحرمة).

واتا: ئافرەت لە کاتی ئیحرامدا نیقاب ناکات .

البرقع : لە قوماشیٚ دروست دەکریٚ کە دیوی ناوەوەی دیار نەبیٚ ئەو شوێنە دادەپۆشیٚ کە دەیگرێتەوە.

هەردوو دەستی ئەگەر دەست کێشی لە دەست بوو ئەبیٚ لایبەریٚ ئەگەر پێش ئیحرام لە دەستی کردبیٚ - شتێکە بۆ هەردوو دەست بەکاردەهێندریٚ و دای دەپۆشیٚ وە دەم و چاوی دادەپۆشیٚ بە بیٚ ئەوەی نیقابی کردبیٚ.

شێخی ئیسلام دەفەرمویٚ: ئافرەت عەورەتە ئەبیٚ جل و بەرگیٚ لەبەرکات کە هەموو لاشەی داپۆشیٚ بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە کە دەستکێش و نیقاب بەکاربهێنریٚ لەو کاتەدا ئەگەر شتیٚ هەبیٚ دەم و چاوی پیٚ داپۆشیٚ جائزە وە نابیٚ زۆر بکریٚ لە ئافرەت کە دەم و چاو و دەستی داپۆشیٚ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەست و دەم و چاوی وەك یەك یەکسان کردووە . وە هەردووکیان وەك لاشەی وایە نەك وەك سەری وە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەم و چاویان دادەپۆشی (اسوال )

قوماشێكە لە سەریەوە شۆڕی بكاتەوە بۆ سەر دەم و چاوی بەڵام بەستنەوەی بە دەم و چاویەوە دروست نیە لە زانایانی علم نەهاتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی تەنها وتەی پێشینە.

ئبن قەیم دەفەرموێ: لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتووە كە ئافرەت دەم و چاوی دانەپۆشێ لە كاتی ئیحرامدا بەڵام ڕێگری كردووە كە نیقاب بكات .

سابت بووە لە أسما ء كە دەم و چاوی دادەپۆشێ لە ئیحرامیدا بووە . عائیشە (رضی الله عنها ) : سواری بە لاماندا دەهاتن ئێمە لە ئیحرامدا بوین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نزیك بونایاتەوە لێمان سەرپۆشەكانمان دەم و چاومان پێ دادەپۆشی كە دوور دەكەوتنەوە لامان دەبرد .

بزانە خوشكی موسڵمان لە ئیحرامدا بە دەرخستنی دەم و چاو و هەردوو دەست لە كەسی نامەحرەم داپۆشە.

ئەبێ دەم و چاوت داپۆشی هەردوو دەستت بە لەچك و جلەكانت .

**٧- يجوز للمرأة أن تلبس حال إحرامها ما شاءت من الملابس النسائية التي ليس فيها زينة.**

**جائزە ئافرەت لە كاتی ئیحرامدا هەر جلێ لەبەر كات كە جوانی دەرنەخات و جلی ڕازاوە نەبێ**

نابێ لە جلی پیاوان بكات نابێ تەسك بێ و لاشەی وەسف بكات وە تەنك نەبێ نابێ كورت بێ قاچ و دەستی دەرخات ئەبێ جلی فراوان بێ.

ئبن منذر دەفەرموێ: كۆی زانایان لەسەر ئەوەن كە ئافرەت لە ئیحرامدا بوو نابێ قەمیس و جلی ماڵەوە و پانتۆڵ و خۆ بۆن خۆش كردن و پێڵاوێك كە دەنگی لێوە بێ بەكار بێنێت.

وە هەر جلێك لەبەر بكات نابێ تایبەتی كات بە ڕەنگێكەوە بۆ نمونە سەوز هەر جلێك لەبەر كات لەو ڕەنگانەی كە تایبەتە بە ئافرەت وەك سور و سەوز و ڕەش وە هەر كاتێ ویستی بیگۆڕێ بە ڕەنگێ.

**٨-سونەتە كە لە دوای ئیحرام بڵێ ( لبيك اللهم لبيك ) بە ئەندازەی ئەوەی خۆی گوێی لێ بێ:**

ئبن بر دەفەرموێ: زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە بۆ ئافرەت سونەتە کە دەنگی بەرز نەکاتەوە تەنها خۆی گوێی لێ بێ لە ترسی فیتنە وە نابێ ئافرەت بانگ بدات و قامەت بکات وە لە کاتی نوێژدا هەڵەیەکی بینی دەبێ چەپڵە لێدات بێ ئەوەی بڵێ سبحان الله.

٩- واجبە تەواف بکات بە دەوری کەعبەدا خۆی داپۆشێ و دوورکەوێتەوە لە قەرەباڵغی و دەنگی نزم کاتەوە و چاوەکانی بەرز نەکاتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە قەرەباڵغی بەتایبەتی لای حجر و روکنی یمانی . وە ئەبێ تەواف بکات لە دوریەوە دوور لە قەرەباڵغی باشترە بۆی لە نزیك کەعبە بێ و لە قەرەباڵغی بێ چونکە حەرامە و دەبێتە فیتنە.

بەڵام کە نزیك بوو لە کەعبە و ماچی حجر الاسود بکات سونەتە بۆی وەنابێ کارێکی حەرام بۆ بە دەستهێنانی سونەتێك . تەنها ئیشارەتی بۆ دەکات .

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: هاوەڵانمان فەرموویانە موستەحەب نیە کە ئافرەت ماچی حجر بکات و سەلامیشی لێ نەکات مەگەر لە کاتی شەودابێ. بۆ ئەوەی زەرەر لە خۆی و غەیری خۆیان نەدەن .

و قال ( المغنی ) : وا باشترە ئافرەت لە شەودا تەواف بکات ئەوە داپۆشراوترە بۆی . ئەتوانێ لەو کاتەدا نزیك بێتەوە لە ماڵی خوا و ماچی حجر الاسود بکات.

**١٠-طواف النساء و سعهن مشی کله :**

**تەواف کردن و ڕۆیشتن لە نێوان سەفا و مەروەدا هەر بە ڕۆیشتن دەیکات:** زانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئافرەت نابێ بە ڕۆیشتنی تۆزێ لە ڕۆیشتنی ئاسایی خێراترە بە دەوری کەعبە و صەفا و مەڕوەدا بڕوات تەنها ڕۆیشتنی ئاسایی لەسەریان نیە ئەو جۆرە ڕۆیشتنە بۆ ئەوەی پێستیان دەرنەکەوێ چونکە مەبەست پێی ئافرەت نیە ئافرەت دەبێ داپۆشراو بێ ئەگەر بەو جۆرە بڕوات ئەوا دەردەکەوێ قاچ و پێستی .

**١١- ما تفعله المرأة الحائض من مناسك الحج و ما لا تفعله حتى تطهر :**

**ئافرەت چی کارێك دەکات لە کاتی حەیزدا هەتا پاك دەبێتەوە: هەموو ڕیٚ و ڕەسمی حەج دەکات لە ئیحرام بەستن و وەستان لە عەرەفە و مانەوە لە مزدلفە و شەیتان ڕەجم کردن تەنها تەواف بەماڵی خوادا ناکات هەتا پاك دەبێتەوە .**

**لقوله (ﷺ) لعائيشه لما حاضت** : (افعلي ما يفعل الحاج غير أن لا تطوفي بالبيت حتى تطهري) .

**واتا : هەموو ڕیٚ و ڕەسمی حەج بکە تەنها تەواف کردن نەبیٚ هەتا پاك دەبیتەوە.**

**و لمسلم في ريواية** : (فَاقْضِى مَا يَقْضِى الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِى بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِى).

**واتا : هەرچیەك حاجی کردی تۆش بیکە تەنها تەواف مەکە بە دەوری کەعبەدا هەتا خۆت دەشۆی.**

**ئیمامی شوکانی دەفەرمویٚ: ئەو فەرموودەیە ئاشکرایە کە ڕێگری کراوە لە ئافرەتی حەیزدار کە تەواف بکات بە دەوری کەعبەدا هەتا خوێنەکەی تەواو دەبیٚ و خۆی دەشوات چونکە ئەو ڕێگریە بۆ ئەوەیە کە پوچەڵی دەکاتەوە ئەگەر تەواف بکات بە دەوری ماڵی خوادا ـ ئەوە قسەی هەموو زانایانە ـ .**

**نابیٚ صفا و مروە بڕوات چونکە ڕاست نیە دەبیٚ لە دوای تەواف بکریٚ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە بەینی صەفا و مەروە نەڕویشتوە تەنها دوای تەواف نەبیٚ.**

**ئیمامی نەوەوی دەفەرمویٚ: ئەگەر پێش هەوڵدان لە نێوان صەفا و مەروە پێش تەواف بیکات ڕاست نیە بەڵام هەندیٚ لە زانایان دەڵێم لە مەزهەبی مالك و أبی حنیفە و أحمد وە هەندیٚ لە زانایان دەفەرموون ڕاستە. بەڵگەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) صەفا و مەروەی کرد پێش تەواف و دەفەرمویٚ لە منی وەرگرن چۆنیەتی حەج کردن .**

**بەڵام فەرموودەی ابن شريك صحابە دەفەرمویٚ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوومە دەرەوە بۆ حەج کردن خەڵکی دەهاتن بۆ لای یەکیٚ وتی** : (فقال قائل يا رسول الله سعيت قبل أن أطوف أو أخرت شيئا أو قدمت شيئا فكان يقول لهم لا حرج إلا على رجل اقترض من عرض رجل مسلم وهو ظالم فذلك الذي حرج وهلك) **تاوان لەسەر کەسیٚ نیە**

ئیسلا کەسێ نەبێ غەیبەتی کەسێك بکات یان قسە بە کەسێك بڵێ ئەو کەسە تاوانی کردووە پێش ئەوەی تەواف بکەم صەفا و مەروەم پێش خست یان دوام خست. تاوانی غەیب کردن گەردن ئازادیە ئەگەر بزانێ کەسەکە قبوڵی دەکات ئەگەر نا دوعای خێری بۆ دەکەی و داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەی ئەگەر بزانی کەسەکە تووشی کێشە دەکات .

شێخی محمد الامين الشنقيطي دەفەرموێ: بزانە هەموو زانایانی عیلم کە هەوڵدان لە نێوان صەفا و مەروەدا دروست نیە ئیلا دەبێ دوای تەوف بکرێ ئەگەر پێشی خست ئەوە ڕاست نیە هەر چوار مەزهەبەکەش کۆکن لەسەر ئەو بابەتە.

و قال في ( المغني) : ڕۆیشتن لە نێوان صەفا و مەڕوە دوای تەواف دێت ڕاست نیە تا تەوافی لە پێش نەکرێ.. ئیمام أحمد دەفەرموێ: ئەگەر بیری چوو ئەوە پاداشت وەردەگرێ لەسەری ئەگەر بە عەمدەن کردی پاداشتی لەسەر وەرناگرێ. چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی پێشخستن و دواخستن لە نێوان صەفا و مەروە فەرمووی لە منی وەرگرن ڕێ و ڕەسمی حەج.

وە ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ لە پێشدا صەفا و مەروە بکات پێش تەواف ئەوە ڕاست نیە چونکە دوو فەرمان دەیگرێتەوە . یان ئەوەیە پێش تەواف ڕۆیشتن لە نێوان صەفا و مەروە بیکات یان بیری چۆتەوە نەیزانیوە بە بێ عەمدەن . ئەوە زۆر دەخایەنێ ئەم بابەتە چونکە لەم سەردەمەدا ئەوە بووە کە فتوای بۆ دراوە ئەو کارەی بکات پێش تەواف.

**ئاگاداری /**

ئەگەر ئافرەت تەوافی کرد لە دوای ئەو تووشی حەیز بوو دەبێ صەفا و مەروە بکات چونکە مەرج نیە لەسەر پاکێتی بێ.

زۆربەی زانایان دەڵێن مەرج نیە لەسەر پاکێتی کە هەوڵدان لە نێوان صەفا و مەروە . و وتەی عطاء و مالك و شافعی و أبو ثور و أصحاب الرأی وتویانە هەتا أبوداود دەفەرموێ: گوێم لە أحمد بوو دەیفەرموو ئەگەر ئافرەت تەوافی کرد بە دەوریماڵی خوادا دوای ئەوە تووشی سوڕی مانگانە بوو وە هەوڵیدا لە نێوان صەفا و مەڕوە

پاشان ڕۆیشت . وە ڕیوات کراوە لە عائیشە و أم سلمە فەرموویانە ئەگەر ئافرەت تەوافی ماڵی خوای کرد و دوو ڕکات نوێژی کرد دوای ئەوە کەوتە حەیزەوە دەبێ صەفا و مەروە بکات .

**١٢- يجوز للنساء أن يتفرن مع الضعفة من المزدلفة بعد غيبوبة القمر :**

**جائزە ئافرەت زوو بڕوات بۆ موزدەلیفە دوای ئاوا بوون :**

وە حجرەی عەقەبە : حەوت بەرد بەردی پێدادا بە گەیشتنی بۆ مینا لە ترسی قەرەباڵغی .

هیچی تێدا نیە کە کەسی لاواز و ئافرەت ئەو کارە بکەن وەك بەزەییەك وایە بۆیان وەك پێشەوامان بکات (ﷺ) ڕای زانایانی لەسەرە.

ئیمامی شوکانی دەفەرموێ: بەڵگەکان دەلیلن لەسەر ئەوەی کاتی ڕەمی دوای خۆرهەڵاتنە بۆ ئەو کەسەی ڕوخسەتی نیە ئەوەی ڕوخسەتی هەیە لە ئافرەت و لاواز جائزە پێش ئەو کاتە بکرێ.

ئیمامی نووی و شافعی و هاوەڵانی : سونەتە لاواز و ئافرەت پێش بخرێت پێش خۆرهەڵاتن لە دوای نیوەی شەو بڕۆن بۆ مینا ڕەمی حجرەی عەقەبە بکا پێش قەرەباڵغی.

**١٣- ئافرەت لە قژی کورت دەکاتەوە بە قەد پە نجەیەك:**

ئافرەت نابێ سەری سفر بکات یان هەمووی بتاشێ بە قەد سەرە پەنجەیەك .

قال في (المغني) كە شەرعیە ئافرەت کورتی بکاتەوە بێ ئەوەی قژی بتاشێ.

أبن منذر: کۆن زانایان دەفەرموون ئافرەتیش دەبێ کورتی بکاتەوە چونکە لە حەقی ئەوانیشە.

أبن عباس دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( لەسەر ئافرەتێ نیە سەری بتاشێ تەنها کورتی بکاتەوە ).

وە لە عەلی فەرموویەتی: ( ڕێگری کردووە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئافرەت هەموو سەری بتاشێ.

أحمد دەفەرموێ: کورت کردنەوە بە قەدەر سەرە پەنجەیەك لە هەموو سەردەمێکدا بەو جۆرە بووە.

أبو داود دەفەرموێ: گوێم لە أحمد بووە فەرموویەتی : ئافرەت هەموو قژی کۆ دەکاتەوە و دەیهێنێتە پێشی سەری لە سەر تاڵی پێشەوەی بەقەدەر پەنجەیەك دەبڕێ.

ئیمامی نووی دەفەرموێ: زانایان کۆدەنگت کە فەرمان نەکراوە بە ئافرەت سەری بتاشێ تەنها کورتی بکاتەوە چونکە ئەوە کارێکی داهێنراوە لە مافی ئەوان .

١٤- ئافرەتێ کە لە حەیزدا بێ ڕەمی حجرەی عەقەبەی کرد و سەری کورت کردەوە ئەوە ئیحرامەکەی تەواو دەبێ تەنها بۆ هاوسەری حەڵاڵ نابێ ئەبێ تەوافی ئیفازە بکات ئەگەر لەو کاتەدا جماعی کرد دەبێ فدیە بدات ئەویش سەربڕینی مەڕێ لە شاری مەککە دابەشی کات بەسەر فەقیرانی ئەو شوێنە . ئەوە یەکەم کارە کە بۆی حەڵاڵ بێ.

**١٥- ئەگەر ئافرەت تووشی حەیز بوو لە دوای تەوافی ئیفازە دەتوانێ سەفەر بکات و تەوافی ماڵئاوایی ناکات و لەسەری لا دەچێ :** بە فەرموودەی عائیشە رضي الله عنها فەرمووی صفیە بنت حی لە دوای تەوافی ئیفازە تووشی حەیز بوو پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەهۆی ئەوە بوو کە دوات دەخات فەرمووی یا رسول الله تەوافی ئیفازەی کردووە و تەوافی کردووە بە ماڵی خوادا توشی حەیز بووە دوای تەوافی ئیفازە فەرمووی کە وایە با لە مەککە دەرچێ و حەجەکەی تەواو بووە . فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی (أحاسبتنا) بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە تەوافی ئیفازە مەرجە بۆ تەواو کردنی حەج دەبێ ئەنجام بدرێ.

ئبن عەباس دەفەرموێ: ( فەرمانی بە خەڵکی کرد کە کۆتا پەیمانیان بە دەوری ماڵی خوادا بێ بەڵام سوك کراوە لەسەر ئافرەتی حەیزدار . وە ڕوخسەت دراوە بە ئافرەت حەیزدار کە بڕوات پێش ئەوەی تەواف بە دەوری کەعبەدا بکات ئەگەر تەوافی ئیفازەی کردبێ .

**ئەمەش وتەی هەموو زانایانی علمە وە حوکمی ئافرەتی زەیستان وەك ئافرەتی حەیزدار وایە چونکە هەمان حوکمی یەکتریان هەیە.**

**١٦- سونەتە ئافرەت سەردانی مزگەوتی مەدینە بکات نوێژی تێدا بکات و دوعا بکات بەڵام نابێ سەردانی گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) بکات چونکە ڕێگری لێکراوە سەردانی قەبر بکات .**

**شێخ محمد بن ابراهیم أل شیخ مفتی شاری سعودیە دەربارەی ئەو مەسەلەیە: بۆیە ڕێگری لە ئافرەت کراوە سەردانی گۆڕی پێغەمبەر بکات (ﷺ) لەسەر دوو فەرمان بەهۆی بوونی بەڵگەکان نابێ کەسیش تایبەتی بکات تەنها بە بوونی بەڵگە نەبێ وە هەروەها شێخ عبدالعزیز بن باز دەفەرموێ : کە باسی سەردانی قەبری پێغەمبەر دەکرێ (ﷺ) بۆ کەسێ سەردانی گۆڕەکەی بکات تەنها مافی پیاوانە و ئافرەت بۆیان نیە سەردانی بکەن . جێگیر بوو لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ: لەعنەتی خوا لە ئافرەتان بێ ئەوانەی سەردانی گۆڕستان دەکەن وە خانووی لەسەر دروست دەکەن و گڵۆپی لێ دادەگیرسێنن .**

**بەڵام ئەگەر مەبەستی نوێژ کردن بوو لەگەڵ دوعا بوو تێیدا ئەوە ڕێگە پێدراوە لەسەر هەموو خەڵکی .**

**ئەی ئافرەتی موسڵمان دڵنیابە حیجاب دەتپارێزێ لە سەرنج و تێڕوانینی خەڵکانی دڵ نەخۆش . و ناهێڵێت کەس بە چاوی تەماع سەیرت بکات گوێ مەدە بەو دعایانەی کە شەڕی حیجاب دەکەن لەگەڵت و یان لە بەها و قیمەتی حیجاب کەم دەکاتەوە ئەوانە شەڕیان بۆ دەوێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ:** { عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا } [النساء: ٢٧].

## بەشی نۆیەم

## حوكمەكانی تایبەت بە هاوسەرگیری و كۆتایی هێنانی :-

يقول الله تعالى: [ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١)] الروم.

و يقول الله تعالى : [وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٣٢)]النور.

**ئیمامی أبن كثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەمە فەرمانە بە ژن هێنان وە هەندێ لە زانایان دەفەرموون كە واجبە هەركەسێ توانای هەبێت ژن بهێنێت . وە ئەوەش فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگرن بە بەڵگە دەفەرموێت :** (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ) **ئەمەش لە صحیحیندا هاتووە كە لە ئبن مەسعود وەرگیراوە واتای فەرموودەكەش ئەوەیە كە دەفەرموێ ئەی كۆمەڵی گەنجان هەر كامێكتان توانای ژن و مێردایەتی هەیە با ژن بهێنێت ئەوەش بۆ چاو باشترە كە نەزەر نەكات و بۆ پاك داوێنی باشترە ئەوەیشی ناتوانێ بە ڕۆژوو بێت چونكە (ڕۆژوەكە ) قەلغانە بۆی ئنجا باسی ئەوە دەكات كە هاوسەرگیری هۆیە بۆ دەوڵەمەند بوون بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە:** [ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٣٢) ] النور.

**واتە: ئەگەر هەژار بن خوای گەورە بە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندیان دەكات . وە باس لەوەش دەكات كە لە أبی بكر الصديق (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) وتویەتی گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بكەن، خوای گەورە پەیمانی پێداون بە دەوڵەمەند بوون و پەیمانی خۆشی دەباتە سەر:** [ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ(٣٢)] النور.

**ئەگەر هەژاریش بن دەوڵەمەندیان دەكات بە فەزڵی خۆی .**

وە ابن مەسعودیش دەڵێ: دەست بە نکاحەوە بگرن واتە ژن بێنن چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: [ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٣٢) ] ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی : خوای گەورە نیکاح و جیابونەوەی بۆ موسڵمان مباح کردووە ، وە ئەگەر جیابوەوە لە ژنەکەی بۆی هەیە جارێکی تر مارەی بکاتەوە بە مەرجێ شوو بکاتە پیاوێکی تر و لەویش جیا ببێتەوە وە یان بمرێ ئەوا دروستە بۆی . بەڵام نەصارا ژن هێنان حەرام دەکەن لەسەر هێندێکیان بەڵام ئەگەر هاوسەرگیری کرد بۆی نیە جیا ببێتەوە لێی بەڵام یەهودیەکان جیابونەوەیان لا مباحەیە. ئەگەر ژنێك شوی کرد و جیابوەوە لە مێردەکەی بۆی نیە بگەڕێتەوە لای ، نصاری جیابونەوەیان لا نیە بەڵام خوای گەورە هەردووکیانی بۆ موسڵمانان مباح کردووە ... تەواو.

إمام إبن قیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: سودەکانی جیماع کردن یەکێکە لە مەبەستی هاوسەرگیری بێگومان ئەوەش لە بنەڕەتدا بۆ سێ مەبەست دانراوە کە ئەوەش مەبەستە ڕاستەقینەکەیە :-

یەکەم: پاراستنی وەچەی ئادەمیزاد و هێشتنەوەی جۆری مرۆڤ بەم شێوەیە تا ئەو کاتەی خوای گەورە دیاری کردووە بۆ ئەم جیهانە و بۆ ئەم ژیانە.

دووەم: دەرکردنی ئەو ئاوە کە زیان دەگەیەنێت بە مانەوە و پەنگ خواردنی لە جسم دا.

سێیەم: پیادەکردنی ئەو نعمەت و لەزەت کردن .

**هاوسەرگیری چەند سودێکی گەورەی هەیە :** خۆپاراستنە لە زینا وە چاو گرتنەوەیە لە نەزەری حەرام .

وە بۆ دەست کەوتنی وەچە و پاراستنی باوانە .

وە بۆ دەست کەوتنی ژیان و ئارامی پێکەوە ژیانی ژن و پیاو جێگیر بوونی لایەنی دەروونیە .

وە هەروەها هاوسەرگیری هاوکاری کردنی ژن و مێردە بۆ دروست کرنی خێزانێکی باش کە ئەو خێزانەش یەکێکە لە بەردی بناغەی کۆمەڵگای موسڵمان .
سودێکی تری هاوسەرگیری پیاو کەفالەتی هاوسەرەکەی دەکات و دەیپارێزێت ژنیش کاروباری ماڵ ڕێك دەخات و ئەرکی شانی جێبەجێ دەکات کە ئەوە کاری ڕاستەقینەی ژنە لە ژیاندا. نەوەك دوژمنی ئافرەت و دوژمنی کۆمەڵگە پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن ژنیش هاوبەشی پیاوە لە کار کردن لە دەرەوەیماڵەکەی . بەم بیانووە دەریانکرد لە ماڵ و دووریان خستەوە لە کارە ڕاستەکەی . وە کاری ئەویاندا بە کەسێکی تر و کاری کەسانی تریان دایە بەمەش یاسای خێزان تێکچووە و لێکتێنەگەیشتن کەوتە نێوان هاوسەرەکان کە ئەوەش بۆتە هۆی لێکترازان و جیابونەوەیان لەسەر ڕق و کینە دەژین بە یەکەوە.
شیخ محمد أمین الشنقیطي ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ :
بزانە خوا من و تۆش مۆفەق بکات لەوەی کە خوای گەورە حەزی پێ دەکات و ڕازیە پێی کە ئەو بۆچوونە زۆر هەڵە و زەرەرمەندیە پێچەوانەی عەقڵ و هەستە وە دژی وەحی ئاسمانیە و ئەو شەرعەی خوای گەورە دایناوە لەوە کە ژن و پیاو یەکسانن لە هەموو یاسا و ڕێساکاندا. ئەوەش فەسادی و پشێوی تێدایە لە یاسای کۆمەڵگای ئینسانی کە ئەوەش ناشارێتەوە لە کەس مەگەر خوا کوێری کردبن. چونکە خوای گەورە ژنی بە چەند سیفەتێك دروست کردووە کە شایانی خۆیەتی لە دروست کردنی بناغەی کۆمەڵگا و هیچ کەس ناتوانێ بەشداری بکات لەگەڵی وەك دوو گیانی ، مندالْ بوون و شیردان وە پەروەردە کردنی منالْ و هەندێ ئیش و کاری ناو ماڵ کە شایستەی ئەوە وەك چێشت لێنان و هەویر کردن و پاك کردنەوەی ماڵ . وە ئەو کارانەش کە دەیکات لە ناو ماڵی خۆیایەتی کە ئەوەش بۆ ئەو گونجاوە لە پارێزراوی و داوێن پاکی و شەرەفمەندی و ڕێزێکە بۆ ئەو و بەها مرۆڤایەتیەکەی کەمتر نیە لە خزمەتی پیاو کە هەوڵی کارکردن دەدات بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منالْ و پەیاکردنی بژێوی ژیان .

ئەو کافر و بێ دینانە پاگەندەی ئەوە دەکەن ژنیش وەك پیاوە لە خزمەت کردن و کار کردن لە دەرەوەی ماڵ . لەگەڵ ئەوەی لە کاتی دوو گیانی و شیردان و نیفاسدا ناتوانێ هیچ لە کارەکانی ئەنجامدا کە قورسن لەسەری وەك دەبینرێ.

ئەگەر ژن دەرچوو لە ماڵ لەگەڵ مێردەکەی کاروباری ماڵ هەمووی دەمێنێتەوە و کەس نیە منالەکان بپارێزێت شیر بدا بە شیرە خۆرەکەی ، وە ئامادەکردنی خۆراك بۆ هاوسەرەکەی کە گەڕایەوە بۆ ماڵ ، خۆ ئەگەر کەسێکی تری هێنایە ماڵەوە و بە کرێی گرت ئەویش لە ماڵەکەی خۆی ڕادەکات کەواتە ئەنجامەکەی هەروەك یەکە . کەواتە دەرچوونی ژن لە ماڵ لە دەست دانی شەهامەت و دینە .. تەواو .

دەی خوشکی موسڵمان لە خوا بترسە بەو پڕ پاگەندە پیسانە هەڵمەخەڵەتێ . چونکە ئەوانەی هەڵخەڵەتاون شاهیدی دەدەن بۆ ڕووخان و پوچ بوونی ئەو واقیعەی تیا دەژین وە تاقیکردنەوەی ئەوانیش باشترین بەڵگەیە ، سا ئاوڕێ بەرەوە تا گەنج و جوانی شوو کردن پەسەند کە و دوای مەخە بە بیانوی تەواو کردنی خوێندن و کارکردن لە دەرەوە چونکە شوو کردنی سەرکەوتوو بەختەوەری و حەسانەوەی تۆیە تۆڵەی هەموو شتێکت بۆ دەکاتەوە چ خوێندن چ کار و چالاکی ، هیچ شتێك جێگەی شو کردنت ناگرێتەوە .

کاروباری ماڵ و پەروەردەی منداڵ ئەرکی سەرشانتە جێ بەجێی بکە ، کە ئەوە کاری بنەڕەتی تۆیە و بەرهەمی جوانی دەستی تۆیە دەی داوای بە دیلی ئەوە مەکە چونکە هیچ شتێك لەوە باشتر نیە . شو کردن بە پیاوێکی صالح لە دەست مەدە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ، إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ) واتە ئەگەر کەسێك هاتە داواتان دین و شێوەیتان بە دڵ بوو شووی پێ بکەن ئەگەر ئەوە نەکەن دەبێتە هۆی فیتنە و ئاشوبی گەورە لەسەر زەوی .

- **وەر گرتنی ڕای کچ بۆ بە شوو دان** : ئەوەی بە شوو دەدرێت لە سێ حاڵەت تێ پەڕ نابێت . یان کچی بچوکە لە تەمەندا یان کچێ تەمەنی هەیە یان بێوەژنە هەر یەکەشیان یاسای خۆی هەیە .

□–**کچی کەم تەمەن:** خلافی تێدا نیە باوك بە شوی دەدا بێ ئیزنی کچەکە چونکە ئیزنی ناوێت . أبوبکر (ڕەزای خوای لێ بێت ) کچەکەی خۆی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت ) بە شووی دا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە تەمەنی شەش ساڵی و گواستیەوە لە تەمەنی نۆ ساڵان . ئیمامی شوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) دەفەرموێ : ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوك دەتوانێ کچەکەی با بە شوو پێش باڵق بوون وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کچی بچوك شو بکات بە پیاوی بە تەمەن .

و لە (مغنی) شا فەرموویەتی : □– أبن منذر فەرموویەتی هەموومان ( زانایان ) کۆڕاین لەسەر ئەوە بە شودانی کچی بچوك لەلایەن باوکەوە دروستە بە مەرجێ پیاوەکە شایستە بێ ـ منیش دەڵێم : کە أبوبکر (خوا لێی ڕازی بێ ) کاتێك حەزرەتی عائیشەی (ڕەزای خوای لێ بێ ) دا بە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەترین ڕەدی ئەوانەیە کە دەڵێن کچی بچوك نادرێ بە پیاوی گەورەئەوەش لەکەدار دەکەن بە شتی منکری دادەنێن ئەوەش هیچ نیە تەنها جەهلی ئەوان پیشان دەدات .

٢- **کچی بە تەمەن یان باڵق بوو :** دەبێ ئیزنی وەربگیرێ وە ئیزنەکەش بێ دەنگیەتی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ( کچ بە شوو نادرێ تا ئیزنی وەرنەگیرێ) و وتیان چۆنە ئیزنەکەی؟ فەرمووی : کاتێك بێ دەنگ بوو. بێگومان دەبێ ئیزنی لێ وەربگیرێ ئەگەر باوکیش بێ ئەوەش ڕای زانایانە .

٣– **بەڵام بێوەژن:** بە شوو نادرێ تا ئیزنی لێ وەرنەگیرێ ئیزنەکەشی قسە کردنیەتی بە پێچەوانەی کچ بێ دەنگ بوونی کچەکەیە. لە مغنی دا هاتووە سەبارەت بە بێوەژن هیچ کام لە زانایان خلافیان نی یە کە ئیزنەکەی قسە کردنە بۆ وەڵامدانەوە چونکە زمان دەردەبڕێ ئەوەی لە دڵدایە ئەوەش إعتباری پێ دەکرێت لە هەموو کاتێك.

شێخ الاسلام إبن تیمیە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) نابێت ژن بە شوو بدرێ بێ ئیزنی خۆی هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە ئەگەر ئافرەت ڕازی نەبێ شوو بکات نابێ زۆری لێ بکرێت تەنها کچی بچوك نەبێت کە تەنها باوك بە شووی دەدا بێ ئیزنی خۆی بەڵام بێوەژن نابێت بە شوو بدرێت تەنها بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت . نە باوك و نە کەس ناتوانێ زۆری لێ بکات بە کۆڕای موسڵمانان . هەروەها کچی باڵق

بوو تەنها باوك و باپیرە دەتوانن بە شوی بدەن ئەوانیش دەبێ ئیزنی لێ وەربگرن وە زانایان خیلافیان هەیە لەسەر ئەوەی ئیزن وەرگرتن لێی واجبە یان مستحب . ڕاست ئەوەیە کە واجبە بەڵام ولی أمریش پێویستە لە خوا بترسێ لەوە کە ئەیدا بە کێ ئەو کەسەی کچەکەی پێ ئەدا شایستەیە یان بۆ ئەو کچە گونجاوە یان نا چونکە بۆ بەرژەوەندی کچەکە بە شوی دەدا نەك بۆ بەرژەوەندی خۆی .

**وەلی أمر مەرجە لە هاوسەرگیری :** ئەو مافەی دەدرێ بە هاوسەر بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر مانای ئەوە نیە کێی حەز لێیە ببێ بە هاوسەری ئەگەر زیانی بۆ کەس و کار و خێزانەکەی هەبێت. بگرە ئەوە پەیوەندی بە وەلی ئەمرەکەیەوە هەیە ڕێنوینی بکات بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر و ئامادەی مارە بڕینەکەی بێت . خۆ ئەگەر خۆی تەنیا کاری مارە بڕین ئەنجامدا ئەوە ئەو مارە کردنە بەتاڵە . لە سنن دا هاتووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە : (أيما امرأة نكحت نفسها بغير إذن وليها فنكاحها باطل) و لە سنن أربع دا هاتووە : (لا نكاح الا بولي) هەردوو حەدیسەکە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە نکاح دروست نیە بێ وەلی أمر و ترمذی وتویەتی ئیش کردن بەو حەدیسە کراوە لای زانایان لەوانە عومەر و عەلی و ئبن عباس و أبو هريره و جگە لەوانیش . هەرواش لای زانایانی فقهی تابعین هاتووە دەڵێت ( لا نكاح إلا بولی) واتە نکاح کردن نیە بێ وەلی ئەوەش قسی إمام شافعی و أحمد و إسحاقه .

**حوکمی دەف لێدان لەلایەن ژنانەوە بۆ ڕاگەیاندنی هاوسەرگیری :**

دروستە ژنان دەف لێبدەن بۆ ئەوەی ڕایبگەیەنن کە ئەو دوو کەسە هاوسەرگیری دەکەن بەڵام لە ناوەندنی ژنان بێت . نابێت ئالەتی مۆسیقا و لەهو بەکاربێت یان دەنگی ئافرەتی گۆرانی بێژ ببیسترێت. کێشە نیە ژنان هەڵبەست بخوێننەوە بە مەرجێ پیاو گوێ بیستی نەبێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (فصل ما بين الحرام والحلال الدف والصوت) واتە جیا کردنەوەی حەڵاڵ و حەرام لێدانی دەف و بڵاو کردنەوەیە لە نکاحدا.

**شوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ ) دەفەرموێ: ئەو حەدیسە دەلیلە لەسەر لێدانی دەف و هەندێ هۆنراوە وەك هاتین هاتین و ئەوانە نەك گۆرانی شەڕانگێز و بێ تام وەك وەصفی جوانی ئافرەت و بلاو کردنەوەی فجور یان پیا هەڵدانی مەی و شتی قەدەغەکراو . حەرامە چی لەبەر نیکاح بێت یان غەیری نکاح یان هەر شتێکی تری لە هەوو حەرام بێت .**

**دەی ئافرەتی موسڵمان:- زێدەڕەوی مەککە لە کڕینی خشڵ و جل و بەرگ بە بۆنەی هاوسەرگیری چونکە ئەو ئیسرافەیە خوای گەورە باسی دەکات و نەهی لێ کردووە و ئەوەی ئیسراف کات خۆی ناوێت:** [ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ (١٤١) ] الأنعام **ئیسراف مەکەن چونکە خوای گەورە مسرفی خۆش ناوێت . وە پێویستە میانڕەو بێت نەك زیادەڕەو واجبە ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت و حەرامە . بێ گوێی لەگەڵ بکات ...**

**پێویستە ئافرەتی موسڵمان گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت لە أبو هریرەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) فەرموویەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:** (إذا صلت المرأة خمسها وصامت شهرها وحفظت فرجها وأطاعت بعلها فلتدخل من أي أبواب الجنة شاءت) **ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەرزەکەی کرد و داوێن پاك بوو گوێڕایەڵی مێردەکەی کرد لە کام دەرگای بەهەشت حەز دەکا با بچێتە ژوور.**

**هەر لە أبو هریرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) :(** لا يحل لامرأة أن تصوم و زوجها شاهد إلا بإذنه و لا تأذن في بيته إلا بإذنه) **حەڵاڵ نیە بۆ ژن بە ڕۆژوو بێت و مێردەکەی حازر بێت ئیلا بە ئیزنی مێردەکەی نەبێ . وە نابێ کەس بێتە ناو ماڵەکەی تەنها بە ئیزنی مێردەکەی نەبێ .**

**أو هریرە ( ڕەزای خوای لێ بێ ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَانًا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ) واتە : ئەگەر پیاوێك بانگی ژنەکەی کرد بۆ سەرجێی و ژنەکە بە گوێی نەکرد ئەو ژنە تا بەیانی مەلائیکەت لەعنەتی لێ دەکات .**

**وە لە حەدیسێکی تری بوخاری و موسلیمدا ڕیوایەتیان کردووە :** ( والذي نفسي بيده ما من رجل يدعو امرأته إلى فراشه فتأبى عليه إلا كان الذي في السماء ساخطا عليها حتى يرضى عنها ) **واتە سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە هیچ پیاوێك نیە بانگی ژنەکەی بکات بۆ سەرجێی ژنەکەی پشتی تیٚ بکا ئیلا ئەوەی لە ئاسمانەکانە لێی توڕە دەبیٚ تا مێردەکەی ڕازی نەکات ) .**

**وە مافی پیاو لەسەر ژن ئەوەیە کە بیٚ ئیزنی مێردەکەی لە ماڵ نە چێتە دەرەوە ماڵەکەی بە باشی بۆ بەڕێوە ببات .**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (والمرأةُ راعيةٌ على بيتِ زوجِهَا وهي مسئولة) **واتە ژن شوانە لە ماڵەکەی بەرپرسیارێتی هەموو شتی لە ئەستۆدایە .**

**وە مافی پیاوە لەسەر ژن ئیش و کاری ماڵ بە جوانی بکات و پێویست ناکات ئیشکەری بێگانە بێنێتە ماڵەوە کە ببێتە هەڕەشە بۆ سەر خۆی و ماڵ و منداڵی .**

شـيـخ الاسـلام ابن الـتـيـمـيـة: **( ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ ) دەڵیٚ: ئەو ئایەتە پیرۆزە** [ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ ]النساء.

**واجبی دەکات لەسەر ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت بە یەکجاری لە هەموو شتدا وەك خزمەت کردن سەفەر کردن لەگەڵی ... هەروەك لە سوننەتدا هاتووە... تەواو .**

**زانای پایەبەرز** أبن القيم **( ڕەحمەتی خوای بیٚ بیٚ ) دەڵیٚ: بەڵگەی خزمەت کردنی بۆ ماڵ و منداڵەکانی ختابی خوای گەورەیە.**

**بەڵام وازهێنانی ژن لە خزمەت کردنی مێرد و ماڵداری لە پاك کردنەوە و جل شۆردن و هەویر کردن و چەندین کاری تر ئەوە خراپەیە ژن دەیکات وە خوای گەورەش فەرموویەتی:** [ وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ(٢٢٨) ] البقرة.

**واتە: لەسەر ژنیش واجبە باش ڕەفتار کردن هەروەك واجبە پیاو ڕەفتاری باش بێت.**

**و دەفەرمویٚ:** [ الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَاللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ ] النساء.

واتە: پیاوان بالاّترن لە ژنان دەی کە ژن خزمەتی پیاو نەکات و پێچەوانە بێتەوە کە واتە پیاو دەبێتە ئیشکەر لە ناو ماڵدا و ژنان بالاّتر دەبن ... ئا ئەوەی کە دەفەرموێ بێگومان خوای گەورە واجبی کردووە پیاو نەفەقەی ژن بکێشێت و جل و بەرگی بۆ دابین کات بەرامبەر بەوەی کە لەگەڵی دەخەوێت و کارو باری ماڵ ڕێکدەخات هەروەکو نەریتی زۆربەی هاوسەرەکانە ئەوەش عورف و عادەتە ، عورفیش واجبی کردووە ژن کارەکانی ماڵ ڕێك بخات. و وتویەتی :- وە فەرق نیە لە نێوان ژنی باش و ژنی خراپ یان فەقیر و دەوڵەمەند ئەوە کە فاطمە (ڕەزای خوای لێ بێ ) باشترین ژنی عالەم بووە خزمەتی مێردەکەی دەکرد هاتە لای باوکی پێغەمبەر (ﷺ) شکاتی کرد لەبەر ماندوو بوون . گوێی بە شکاتەکەی نەدا.... تەواو .

**پرسیار: ئەگەر ژنێك بینی پیاوەکەی ڕەغبەتی نیە بۆی بەلاّم ژنە حەز دەکا لای بمێنێتەوە چۆن ئەو هەڵوێستە چارە دەکرێت؟**

وەلاّم :خوای گەورە دەفەرموێت: [ وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً (١٢٨) ] النساء.

واتە: ئەگەر ژنێك ترسا لەوەی مێردەکەی پشتی لێ دەکات و ڕادەکات لەبەری با صلْح بکەن لە نێوان صلحیش خێرترە بۆ ئەوان ). حافظ إبن کثیر دەڵێت : کاتێ ژن ترسا پیاوەکەی ڕادەکات لەبەری یان پشتی لێ دەکات با لە مافەکانی خۆی یان لە هەندێ ماف خۆش بێت وەك نەفەقە و جل و بەرگ و خەوتن یا جگە لەو حەقانەش کە لەسەر پیاوەکە هەیەتی پیاوەکە دەتوانێت قبوڵی بکات لێی هیچ شەرمەزاریەکی تیا نیە ژنەکە خۆش بێت لەو مافانە وە نە شەرمیشە پیاوەکە قبوڵی بکات بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ واتە ئەوە چارەسەرە صلْح بکەن باشترە لە جیابوونەوە.

**ئنجا باسی سودە کچی زومعەی کردووە کە کاتێك بە سالأچوو. داوای کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) جیا بێتەوە بەڵام ئەو صڵحی لەگەڵدا کرد بەڵام سودە لە مافی خۆی خۆش بوو ڕۆژەکەی خۆی دا بە عائیشە ئەویش قبوڵی کرد و مانەوە بەیەکەوە.**

**پرسیار : ئەگەر ژنەکە دڵی بە پیاوەکەی خۆش نەبوو نەیویست بمێنێتەوە لەگەڵی چی بکات ؟**

**وەڵام: خوای گەورە فەرموویەتی:** [ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٢٢٩) ] البقرة.

**ابن کثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی : ئەگەر ژن و مێرد لێك ترازان و ژنە مافی پیاوەکەی نەدا وە نەی توانی هەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵ بکات دەتوانێ ئەوەی وەك مارەیی وەری گرتووە بیگێڕێتەوە بۆی . هیچ شەرمی تیا نیە کە بۆی بگێڕێتەوە وە شەرمیش نیە کە پیاوەکە قبوڵی بکات لێی ئەوەش خلعی پێ دەڵێن.**

**پرسیار : ئەگەر ژن بێ هۆکار و عوزرێك داوای جیابونەوە بکات چی هەڕەشەیەکی لەسەرە؟**

**وەڵام : لە زوبانەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( هەر ئافرەتێ بێ هۆکار داوای جیابوونەوە بکات لە مێردەکەی بۆنی بەهەشت ناکات** (أيما امرأة سألت زوجها طلاقا في غير ما بأس فحرام عليها رائحة الجنة) **چونکە تەڵاق لای خوای گەورە ناخۆشترین حەڵاڵە . کاتێك پەنا بۆ تەڵاق دەبرێ کە پێویست بکات بەڵام بێ ئەوەی کێشەیەك هەبێت مەکروهە کاتێك ژن دەبێ داوای تەڵاق بکات کە نەتوانێ لەگەڵی بژی وەك ئەوەی پیاوەکە مافی پێ نەدا و ژنە مانەوەی لەگەڵی زیانی زۆرتر بێ لە جیابوونەوەی خوای گەورەش:** [ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ ] البقرة.

**واتە یان مانەوە لەگەڵ یەك بە باشی و دروستی یان جیابوونەوە بە باشی.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** [ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٢٦) وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٢٢٧) ] البقرة.

**واتە: ئەوانەی دەیانەوێت جیابنەوە لە ژنەکانیان با چوار مانگ چاوەڕێ بن ئەگەر باش بوەوە نێوانیان ئەوا خوای گەورە میهرەبان و بەخشندەیە ئەگەر هەر سور بوون لەسەر جیابوونەوە ئەوا خوای گەورە بینەر و بیسەرە.**

**ئەوەی لەسەر ژن واجبە دوای تەواو بوونی هاوسەرگیرییان:-**

**دابڕانی ژن و مێرد دوو جۆرە:-**

**یەکەم : جیابوونەوەیان لە ژیاندا.**

**دووەم : جیابوونەوە بە مردن هەردوو جۆرەکەش عدەی تایبەتی هەیە کە چاوەڕوان کردنە لە شەرعدا.**

**وە ئەوەش حکمەتی تیایە حکمەتەکەش بریتیە لەوە کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی تر دروست نیە تا عدە تەواو نەبێت وە ڕەحمی (منالْدان ) ی ژن هیچ منالێکی تیا دروست نەبوو بێت کە هی هاوسەری یەکەمە و گومان دروست نەبێت و نەسەب ون نەکرێت و ڕێزکە بۆ بەڵگەنامەی هاوسەرگیری پێشوو وە ڕێزێکە بۆ هاوسەرە پێشوەکەی کە جیا دەبێتەوە لێی . وە دیار بوونی شوێنەواری ئەوە کە پێی ناخۆشە جیابۆتەوە لە هاوسەرەکەی .**

**عدەش چوار جۆری هەیە :-**

**جۆری یەکەم:- عدەی سك (دوو گیان ): ئەو عدەیەیە بەوە تەواو دەبێت کە منداڵەکەی ناو سکی لە دایك بوو چ جیابوونەوەی یان(یەکجاری ) یان گەڕانەوە بێت ، یان جیابوونەوە بە مردن بێت بە بەڵگەی ئەو ئایەتە پیرۆزە : [ وَأُوْلاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ] الطلاق.**

**واتە: عدەی ژنی دوو گیان ئەوەیە بە لە دایك بوونی منداڵەکەی کۆتایی بە عدەکەی دێت.**

**جۆری دووەم : ئەویش سێ جار کەوتنە حەیزەوە: دوای سێ حەیزەکە کۆتایی بە عدەکەی دێت . هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: [ وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ(٢٢٨) ]** البقرة.

**قروء یانی حەیز.**

**جۆری سێیەم: ئەوەی کە ناکەوێتە حەیزەوە: ئەویش دوو جۆرە ئەوە بچوکە هێشتا باڵق نەبووە یان زۆر بە تەمەنە کە حەیزی نەماوە لە تەمەنی نا ئومێدیایە کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت :** [ وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ ] الطلاق.

**واتە: ئەوانەی بێ ئومێد بوون لە حەیز وە ئەوانەش هێشتا نەکەوتونەتە حەیزەوە عدەکەیان سێ مانگە.**

**جۆری چوارەم: ئەوەی هاوسەرەکەی مردووە: عدەی ئەم جۆرە روونە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت:** [ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤) ] البقرة.

**واتە: ئەگەر پیاوێك مردوو ژنی لە دوای خۆی بەجێهێشت ئەوا چاوەڕوان دەبێت تا چوار مانگ و دە ڕۆژ واتە عدەکەی ٤ مانگ و دە ڕۆژە.**

**ئەوەش هەموو ئەو ژنانە دەگرێتەوە کە پیاوەکەی دخولی کردووە بچوك یان گەورە فەرقی نیە تەنها دوو گیان نەبێت کە بە دەقی ئایەت جیاکراوەتەوە** [ وَأُوْلاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا (٤) ] الطلاق.

**ئەو حەرامە لەسەر ئافرەتێ کە لە عدەیایە :**

**١-حوکمی خوازبێنی کردنی :-**

**أ-ئەو ئافرەتەی ئەمەلی گەڕانەوەی هەیە :- حەرامە داوا بکرێت چ بە ئاشکرا و چی بە پەنهانی چونکە حوکمی ژنی شوداری هەیە و لە ئەستۆی پیاوەکەیدایە.**

**ب- ئەو ئافرەتەی کە لە عدەدایە و نیازی گەڕانەوەی نیە: داوا کردنی حەرامە بە سەراحەت بەڵام چۆن بڵێی بە گوێیدا بدەی مشکلە نیە:** [ وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء(٢٣٥) ] البقرة.

**واتە: کێشە نیە تەنها بدەی بە گوێیدا بۆ شوو کردن بەڵام داوا کردن بە تصریحی نابێت.**

**وەتصریح دەرخستنی ڕەغبەت بۆ هاوسەرگیری وەك بڵێ ئەمەوێ هاوسەرگیری بکەم لەگەڵتدا ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێش ماوەی عدەکەی خۆی داوا بکرێت لەوانەیە ئەویش حریص بێت لەسەر ئەوە کە شوو بکات و هێشتا عدەکەی تەواو نەبووە بە خیلافی تعریض.**

**وە داوا کردنی تعریض ئەوەیە کە تەنها بە شێوازێکی گوماناوی داوای دەکات وەك حەز دەکەم ئافرەتێکی وەك تۆ بخوازم و بۆ ئافرەتی لە عدەدایە دەتوانێ جوابی تعریض بداتەوە بە تعریض بەڵام ناتوانێ جوابی خوازبێنی کەری تصریح بداتەوە.**

**وە ئەو ژنەی ئەمەلی گەڕانەوەی هەیە نابێ جوابی هیچ کامیان بداتەوە نە تصریح و نە تعریض.**

**٢- حەرامە شوو کردنەوە لە کاتی عدەدا:**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** [ وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ ] البقرة.

**ابن کثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ: عەقدی نکاح دانامەزرێ هەتا کاتی عدە تەواو نەبێ زانایان کۆڕان لەسەر ئەوە کە عەقد دروست نیە تا عدە تەواو نەبێ.**

**دوو سودی وەرگرت:-**

**یەکەم:- ئەوەی پێش دخول جیابێتەوە عدەی نیە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە:** [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ] الأحزاب.

**واتە ئەی ئیمانداران ئەگەر ژنێکتان مارە کرد وە جیابوونەوە لێی پێش ئەوەی دخولی پێ بکەن ئەوا عدەی نیە بۆی دانیشێت.**

**إبن کثیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت ئەوەش زانایان لەسەری کۆکن کە عدەی نیە ژنێك مارە کرابێت و جیابووبێتەوە دەتوانێ یەکسەر شوو بکاتەوە ئەگەر حەزی کرد.**

**دووەم:- ئەگەر جیابوەوە پێش دخول وە مارەیی یەکی بۆ دیاری کرابوو ئەوا نیوەی مارەییەکەی دەدرێ بە ژنەکە ئەگەر دیاری نەکرابوو مارەیی ئەوا هەندێ کەل و پەلی بۆ دابین دەکات وەکو جل و بەرگ و نەفەقە وە کە جیابوونەوە دوای دخول کردن ئەوا مارەیی بۆ ژنەکەیە. خوای گەورە فەرموویەتی:** [ لا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ (٢٣٧) ] البقرة.

**ئەی پیاوان تاوان نیە لەسەرتان کە ژن بێنن و جیاببنەوە لێیان پێش ئەوەی بیگوێزنەوە بۆتان هەیە شتێك لە ماڵ ببەخشن پێیان بە گوێرەی حاڵی پیاوەکە باش بن یان خراپ بە پێی عورف، ئنجا خوای گەورە فەرمان دەکات نیوەی مارەیی یەکەی بدات. إبن کثیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ پێدانی نیوەی مارەیی زانایان کۆڕان و خیلافیان نی یە.**

**٣-حەرامە لەسەر ژنێك مێردەکەی وەفاتی کردبێ پێنج شت ئەوەش پێی دەوترێ حداد ( واتە سنوردانان ):**

**یەکەم : هەموو جۆرە بۆنێك : گیان و جل و بەرگی بۆن خۆش ناکات وە شتی بۆن خۆش بەکارناهێنێت واتە ( بۆن بەکارناهێنێ) .**

**دووەم : خۆڕازاندنەوە :- خۆ جوان کردن و ڕازاندنەوە وەك خەنە کردن یان بۆیە کردن و چاو ڕشتن بە کل یان هەر شتێکی تر تەنها بۆ عیلاج کردن چاو بڕژێ بە کل لە شەودا و بە ڕۆژ بیسڕێت ، یان وەك دەرمان بۆ چاو ، غەیری کل بەڵام جوانی تێدا بەدی نەکرێ.**

**سێیەم :- پۆشینی پۆشاکی ڕازاوە و ئاڵا و واڵا : تەنها جلێ بکاتە بەری ڕازاوە نەبێت و ڕەنگێ تایبەت نەکات بۆ لەبەر کردن وەك خەڵکی عادەتی پێوە گرتووە.**

**چوارەم : بەکارهێنانی خشڵ بە هەموو جۆرەکانی تەنانەت مستیلەش :**

**پێنجەم : مانەوە لە ماڵی غەیری مێردەكەی دروست نیە :** و ناچێتە ماڵی تر بمێنێتەوە بە شەو تەنها بە عوزری شەرعی.

نابێ لە ماڵ بچێتە دەرەوە بۆ لای هاوڕێ و خزم و سەردانی نەخۆش . دروستە بە ڕۆژ بچێتە دەر بۆ ئەنجامدانی هەندێ كاری پێویستی خۆی جگە لەو پێنج شتە هیچی لێ قەدەغە ناكرێ كە خوای گەورە بۆی داناوە.

إمام إبن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) فەرموویەتی : نینۆك كردن قەدەغە نیە بۆی وە لابردنی مووی ئەو شوێنانەی بۆی دروستە . وە خۆشۆردن بە صابون دروستە بۆی هەروەها قژ داهێنان دروستە بۆی.

إبن تيمية (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بۆی دروستە چ خواردنێك حەزی لێیەتی بیخوات وەك گۆشت و میوە و خواردنەوەی مباحەكان تا ئەوەی دەڵێت حەرام نیە كار بكات وەك كاری دەستی وەك چنین و درومان كردن و ڕستن وە هەموو شتێ كە موباح بێت بۆی دروستە وەك ئاخاوتن لەگەڵ خەڵكی و پیاوان بە مەرجێ داپۆشراو بێت . ئەوەی باسكرا سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) بووە كە ژنانی مێرد مردوو كردوویانە ... تەواو.

ئەوەی خەڵكی نەفام دەیڵێت ڕووی دادەپۆشێ لە مانگ وە قسە لەگەڵ پیاو ناكات وە دەبێ ڕووی داپۆشێ لە مەحرەمەكانیان و چەند شتی تر كە ئەوانە هیچ بنەمای ڕاستی نیە والله أعلم.

## ( بەشی دەیەم )

## ( في بيان أحكام تحفظ للمرأة كرامتها متصون عفتها )

## ( پاراستنی ئافرەت و کەرامەتی وە پارێزگاری لێ کردنی )

**١-ئافرەتیش وەك پیاو دەبێ چاوی بپارێزێ لەگەڵ دامێنی :**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** [ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٣٠) وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ] النور.

**واتا: ئەی محمد (ﷺ) بە پیاوانی باوەڕدار بڵێ چاوی خۆیان بپارێزن لە تێڕوانینی حەرام وە دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا وە لەوەی کە کەس نەیبینێ ئەمە بۆ دڵ و دەروون و دینیان پاکترە بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانیاریەکی وردی هەیە بەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن وە ئەی محمد (ﷺ) بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ با چاوی خۆیان بپۆشن لە تێڕوانینی پیاوی نامەحرەم وە با دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا وە لەوەی کە کەس نەیبینێ.**

**ئیمامی شنقیطی دەفەرموێ: خوای گەورە فەرمانی کردووە ئیمانداری ژن و پیاو چاوی خۆیان بپارێزن وە دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا و نێربازی و المستحقه واتا چۆن نێربازی پیاو لەگەڵ پیاوانە بە هەمان شێوە ئافرەتیش لەگەڵ ئافرەت حەرامە وە خۆپارێزی بکەن لەو کارانە وە خوای گەورە بەڵێنی داوە بە هەرکەسێ فەرمانی خوای گەورە بەجێ بهێنێ لە پیاوان و ئافرەتان لێخۆش بوون و پاداشتێکی گەورەیان هەیە .**

**دەفەرموێ:** [ إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً (٣٥) ] الأحزاب.

واتا: بەڕاستی پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان و ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن لە پیاوان و ئافرەتان وە ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوای گەورە دەکەن لە هەموو حاڵەتێکدا ئا ئەمانە بە ژن و پیاوەوە خوای گەورە لێخۆش بوون و ئەجر و پاداشتێکی زۆر گەورەی بۆ ئامادە کردوون .

کردنی ئەو کارە ئافرەت لەگەڵ ئافرەت خراپە بکەن تاوانێکی گەورەیە هەردووکیان دەبێ ئاقڵ بکرێن.

لە (المغنی) دەفەرموێ: ئەگەر دوو ئافرەت بە یەکەوە کاری خراپە بکەن هەردووکیان بە زیناکار حسابن و لەعنەتی الله یان لەسەرە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (وإذا أتت المرأة المرأة فهما زانيتان).واتا : ئەگەر دوو ئافرەت کاری خراپە بکەن ئاوا هەردووکیان زیناکارن)

دەبێ ئافرەتی موسڵمان ئاگادار بێت بەتایبەتی گەنجەکان نزیك نەبنەوە لەو کارە خراپەیە.

ئبن قیم دەفەرموێ: چاوپاراستن دەبێتە پاراستنی دامێنیش چونکە لە پێشدا چاو دەیبینێ پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) : (فلا تتبع النظرة النظرة فإنما لك الأولى).

واتا: ئەی عەلی سەیر کردن بە دوای یەکدا مەکە تەنها یەك سەیر کردن چونکە سەیر کردن تووشی ڕووداوت دەکات کە مرۆڤ تووش دەکات دەچێتە دڵەوە دوای بیر کردنەوە دوای ئەوەش بیرکردنەوە بە شەهوەت دوایش ویستی لێ دەبێ دواتر بەهێز دەبێ ئامادە دەبێ بۆ ئەو کارە .

بۆیە وتراوە : ( ئارام گرتن لەسەر چاو پاراستن ئاسانترە لە ئارام گرتن لەسەر ئازارەکەی لە دوایدا).

خوشکی موسڵمان سەیری وێنەی ئافرەت مەکە کە لە ناو گۆڤارەکاندا یان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان یان ڤیدیۆ بۆ ئەوەی سەلامەت بیت لە تاوان چونکە دوای دەبێتە پەشیمانی بۆ خاوەنەکەی .

**٢- هۆکاری تر بۆ داوێن پارێزی دوورکەوتنەوەیە لە گۆرانی و مۆسیقا :**

ئبن قیم دەفەرموێ: یەکێك لە فێڵەکانی شەیتان ئەوانەی کە کەم علم و عەقڵ و دینن وە ڕاوی دڵە نەزانەکان و پوچەکانی پێ دەکەن گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقای حەرام کە دوورت دەخاتەوە لە قورئان و تاوان و فاسقی ئەوانە دۆستی شەیتانن وە پەردە لە نێوان ئەوان و خوای گەورەدا هەیە ئەو ڕوقیەی زینا و نێربازی یە ئەو کەسە عاشقە فاسقە مەبەستێتی بگات بە مەعشوقەکەی وە ئەگەر لە ئافرەتەوە بێ ئەو گۆرانیە ئەوە بەهێزترە بۆ خراپە کردن.

گومانی تێدا نیە هەموو کەسێ کە غیرە بکات لە خێزان دوری دەخاتەوە لەو کارانە.

ئاشکرایە ئافرەت گۆرانی بڵێ زووتر دەچێتە دڵی پیاوانەوە بۆیە خوشکی موسڵمان لە خوا بترسە و دوور بکەوەرەوە لەو جۆرە نەخۆشیە کە گوێ گرتنە لە گۆرانی بە هەموو جۆرەکانیەوە

زۆربەی ئافرەتانی جاهیل و نەزان داوای گۆرانی و سەرچاوەکەی دەکەن و لە نێوان یەکتریدا دەیگۆڕنەوە.

**٣-هۆکارێکی تر بۆ پاراستنی دامێنی ئافرەت ڕێگری بکرێ کە بە تەنها سەفەر نەکات بە بێ مەحرەم :**

چونکە دەیپارێزێ لە کەسانی بە تەماع و فاسق فەرموودەی ڕاست هاتووە کە ڕێگری لە ئافرەت کراوە بە بێ محرەم سەفەر نەکات .

دەفەرموێ: ( با ئافرەت سەفەر نەکات سێ ڕۆژ لەو شوێنە بمێنێتەوە بە بێ مەحرەم ).

لە فەرموودەیەکی تردا : ( حەڵاڵ نیە ئافرەت لە شوێنێك بمێنێتەوە شەو و ڕۆژێ بە بێ مەحرەم ).

جیاوازی نێوان سێ ڕۆژ دوو ڕۆژ ئەوەی ئێستا ڕێگای هاتووچۆ ئاسان بووە جیاوازی لە نێوان فەرموودەکاندا هەیە کە سێ ڕۆژ و دوو ڕۆژ و شەو و ڕۆژێ لەوە کەمتریش بێ زانایان دەفەرموون نابێ بە تەنها سەفەر بکات و ڕێگری لێ دەکرێ.

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ:ئەوەی ناوی سەفەر بێت نابێ ئافرەت بە بێ مەحرەم سەفەر بکات ئەگەر سێ ڕۆژ یان دوو ڕۆژ یان یەك ڕۆژیش بێ چونکە فەرموودەی ئبن

عباس ئاشکرایە کە نابیٚ بە بیٚ مەحرەم سەفەر بکات کە هەموو سەفەریٚ دەگریٚتەوە
.

وە ئەو کەسەی فتوای ئەوە دەدات کە ئافرەت سەفەری حەج بکات لەگەڵ کۆمەڵیٚ ئافرەتی تر ئەوە پیٚچەوانەی سونەتە.

ئیمامی خطابي دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) ڕیٚگری کردووە کە ئافرەت نابیٚ سەفەر بکات بە تەنها بە بیٚ مەحرەم پیٚچەوانەی سونەتە ئەگەر سەفەری کرد لەگەڵ کەسی نامەحرەم ئەوە پابەند نەبووە لە حەجەکەیەوە و تووشی تاوان بووە چونکە ئەوە گویٚڕایەڵی کردنی فەرمانیٚکە کە دەیگەنیٚ بە تاوان .

دەفەرمویٚ: ڕیٚگە نەدراوەسەفەر بکات بە بیٚ مەحرەم چۆن ڕیٚگای بۆ ئاسان کات بڕوات بۆ حەج بە تەنها.

ئیمامی نەوەوی دەفەرمویٚ: ڕیٚگە نەدراوە کە سەفەر کات و تجارەت بکات و سەردانی بکات بە بیٚ مەحرەم .

بەڵام ئەوانەی کە ئاسانی دەکەن لەم زەمانەدا کە سەفەر بکات بە بیٚ مەحرەم هیچ زانایەك موافقی قسەی ئەوانە نیە کە بۆیان جائز دەکەن.

دەڵیٚن مەحرەمەکەی تا دەرگای تەیارە دەیبات و لەویٚش مەحرەمیٚکی تر پیٚشوازی لیٚ دەکات کە دەگاتە ئەو وڵاتەی تر چونکە دەڵیٚت تەیارە زۆری لە ئافرەت و پیاو تیٚدایە.

ئیٚمەش پیٚیان دەڵیٚین: نەخیٚر ناو تەیارە ترسناکی خۆی هەیە چونکە ئەوانەی لە ناو تەیارەکەن هەمووی تیٚکەڵاویە لەوانەیە لای پیاویٚکەوە دانیشیٚ لەوانەیە تەیارەکە تووشی ئەوە بیٚت ڕوو بکاتە فڕۆکەخانەیەکی تر کەس نەبیٚ پیٚشوازی لیٚ بکات تووشی خەتەریات بیٚت ئافرەت لەو کاتەدا چی بکات لەو شارە کەس ناناسیٚ و مەحرەمی خۆی لیٚ نیە .

**٤-هۆکاریٚکی ترسی پاراستنی داویٚن ڕیٚگری کردنی مانەوەی پیاو و ئافرەت بە تەنها و بە بیٚ مەحرەم :**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَخْلُوَنَّ بِامْرَأَةٍ لَيْسَ مَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا فَإِنَّ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ)واتا : (هەرکەس باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با بە تەنها لەگەڵ ئافرەتێ نەمێنێتەوە بە بێ مەحرەم چونکە سێیەمیان شەیتانە).**

**فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (لا يخلون رجل بامرأة لا تحل له فإن ثالثهما الشيطان إلا محرم)واتا ( با پیاوێ لەگەڵ ئافرەتێ نەمێنێتەوە کە بۆی حەڵاڵ نیە سێیەمیان شەیتانە ئیلا محرم نەبێ.**

**ئیمامی شوکانی دەفەرموێ: مانەوە لەگەڵ کەسێکی بێگانە کۆی زانایان ئەوەیە کە حەرامە شەیتان سێیەمیانە ئەکەونە تاوانەوە بەڵام لەگەڵ بوونی مەحرەم مانەوە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم جائزە.**

**وە هەندێ ئافرەت و وەلی ئەمرەکانیان ئاسانیان کردووە مانەوە لەگەڵ:**

**١-خزمی نزیکی مێردی و دەم و چاوی ببینێ ئەو مانەوەیە گەورەترین خراپەیە.**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ( اياكم و الدخول على النساء ) واتا : ئاگاداربن نەچنە لای ئافرەتان بە تەنها پیاوێ لە ئەنساریەکان وتی ئەی ئەگەر لەگەڵ شوبرای یان خزمی مێردی ؟ فەرمووی : شوبرا مردنە.**

**أبن حجر نووی ئەفەرموێ: زانایان کۆن لەسەر وشەی الامماء واتا کەسی نزیکی مێرد وەك باوکی مامی برای کوڕی برای ئامۆزای چونکە کەسی مێرد نامەحرەمن فەرموودەی شوبهاندویەتی بە مردنەوە چونکە ئەولاترە کە ڕێگری بکرێ.**

**شوکانی دەفەرموێ: ( الحمو) وەك مردن چۆن ئەترسێ ئەو زیاترە . لە خوا بترسە خوشکی موسڵمان ئەو کارانە ئاسان مەکە چونکە عیبرەت وەرگرتن بە شەرعە نەك بە عادەتی خەڵك .**

**ئاسان کردنی هەندێ لە ئافرەتان و وەلی ئەمرەکانیان کە ئافرەت بە تەنها لە ناو تەکسیدا لەگەڵ سایەقێکی نامەحرەم چونکە ئەوە خەڵوەتە حەرامە :**

**شێخ محمد بن ابراهیم موفتی وەڵاتی سعودیە دەفەرموێ: گومانی تێدا نیە کە ئافرەت لەگەڵ سایەق تەکسیدا بە تەنها بڕوات و بە بێ مەحرەم چەند خراپەیەکی**

**هەیە ئەگەر ئافرەتەکە کەسێکی ئاقڵ بێ یان قسە لەگەڵ خاوەن سەیارەکە بکات وە ئەو پیاوەی کە ڕازی بێ خێزانی بەو جۆرە بڕوات ئەوە دینەکەی لاوازە نوقسانە لە پیاوەتیدا غیرەتی کەمە لەسەر مەحرەمەکانی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (لا** يخلون رجل بامرأة فإن الشيطان ثالثهما) .

**واتا : ئەگەر پیاو و ئافرەتێ بە تەنیا بن شەیتان سێیەمیانە سوار بوون لە ناو سەیارە زۆر گەورەترە لەوەی کە لە ماڵ بمێنێتەوە لەگەڵی چونکە ئەتوانێ بۆ هەر شوێنێکی بوێت بیبات یان بە زۆر بێ یان بە ئارەزوی خۆی.**

**ئەو کەسەی کە زۆر دەڕواتە دەرەوە منالێ کیفایەت نیە چونکە هەندێ ئافرەت هەیە وا گومان دەبەن کە منداڵی لەگەڵ بێ گومانێکی خراپە.**

**ئیمامی نووی دەفەرموێ: ئەگەر دوو کەس بە یەکەوە بوون نامەحرەمی یەك بوون حەرامە بە کۆڕای زانایان.**

**هەندێ لە ئافرەتان بۆیان ئاسان کراوە لەلایەن وەلی ئەمرەکانیان کە بڕۆن بۆ لای دکتۆر بۆ چارەسەری ئەوە خرا پەیەکی گەورەیە نابێ بێ دەنگ بن لێی :**

**شێخ محمد بن ابراهیم دەفەرموێ: بە هەر حاڵ کۆبوونەوەی ژن و پیاوێکی نامەحرەم حەرامە لە شەرعدا ئەگەر دکتۆریش بێ و چارەسەر بکات ئەبێ کەسێکی لەگەڵ بێ مێردی یان کەسێکی مەحرەمی ئەگەر کەسی نەبوو ئەوا کەسی نزیکی ئافرەتەکە بڕوات لەگەڵی ئەگەر هەر کەس نەبوو وە نەخۆشیەکەشی ترسناك بوو نەتوانن بە دوای بخەن ئەبێ سستەرێ ئامادەبێ.**

**ڕێگە پێدراو نیە کە دکتۆرێ بمێنێتەوە لەگەڵ ئافرەتێ ئەگەر هاوڕێی خۆشی بوو نابێ مامۆستایەکی کوێر لەگەڵ قوتابیەکەی بێ بە تەنها یان ئافرەتی خزمەتکاری ناو تەیارە لەگەڵ پیاوێکی بێگانە. ئەم کارانە خەڵکی ئاسانکاریان بۆ کردووە بە ناوی شارستانی و لاسایی کردنەوەی کوێرانەی بێ باوەڕان وە بێ گوێدانە حوکمە شەرعیەکان فلا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم.**

**نابێ پیاو لەگەڵ خزمەتکارەکەی بێت کە خزمەتی ماڵەکەی دەکات وە ئافرەتیش بە هەمان شێوە . چونکە موشکیلەی خزمەتکار لە ناو ماڵدا چەندین کێشەی لێ**

**کەوتۆتەوە بەهۆی ئەوەی ئافرەتان مەشغولی دەرس و دەوامن لە دەرەوەی ماڵەکەی پێویستە ئیمانداران زۆر وریابن .**

**حەرامە ئافرەت تەوقە بکات لەگەڵ کەسی نامەحرەم :**

**شێخ ابن باز دەفەرموێ: نابێ بە هیچ جۆرێك تەوقە بکرێ لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم گەنج بێ یان پیر ئەو کەسەشی تەوقە دەکات پیاوێکی پیر بێ یان گەنج چونکە دەبێتە مایەی فیتنە لە پێغەمبەرەوە هاتووە ( ﷺ) فەرموویەتی :** (أني لا أصافح النساء) .

**واتا من تەوقە لەگەڵ ئافرەت ناکەم.**

**عائیشە دەفەرموێ: ( دەستی پێغەمبەری خوا بەر دەستی هیچ ئافرەتێکی نامەحرەم نەکەوتووە و بەیعەتیشی لێ وەرگرتوون تەنها بە قسە).**

**ئیمامی شنقیطی دەفەرموێ: نابێ پیاو تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم بکات نابێ دەستی بەر هیچ شوێنێکی ئافرەت بکەوێ بەهۆی ئەمانەوە:**

□ **-جێگیر بووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی :** (أني لا أصافح النساء) **واتا : من تەوقە لەگەڵ ئافرەت ناکەم .**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا (٢١)﴾ الأحزاب.

**دەبێ تەوقە نەکەین ئێمەش وەکو چۆن پێغەمبەری خوا نەیکردووە بە بەڵگەی ئەو فەرمووادنەی کە پێشتر باسمان کردن لە سورەتی حجدا کە ئافرەت نابێ وە لە سورەتی الاحزابدا لە ئایەتی حیجابدا. لە کاتی بەیعەتدا تەوقەی لەگەڵ هیچ ئافرەتێ نەکردووە کە بەڵگەیەکی ڕوونە کە نابێ پیاو تەوقە لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی نامەحرەم بکات و دەستی بەر هیچ شوێنێکی ئافرەت نەکەوێ چونکە سوکترین جۆری دەست لێدان تەوقە کردنە.**

ئەگەر ئەو کاتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لە کاتی بەیعەت دان ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نابێ وە نابێ کەس پێچەوانەی ئەو قسە و کردەوەی بکات .

٢-پێشتر وتمان ئافرەت عەورەتە پێویستە خۆی داپۆشێ وە چاویشی بپارێزێ لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە فیتنەوە چونکە دەست بەرکەوتنی لاشە بە لاشە دەبێ جولاندنی غەریزە وە گەورەترین بانگەشەیە بۆ فیتنە بە سەیر کردنی چاو .

٣- ئەوە ڕێگریەکە لە لەزەت بینین بە ئافرەتی نامەحرەم بەهۆی ئەوەی ترس لە دڵەکان کەم بۆتەوە لەم سەردەمەدا وە ئەمانەت پارێزی نەماوە وە چەندین جار گوێمان لێبووە کە هەندێ پیاو لە کەسانی جاهل و نەفام خوشکی خێزانی ماچ دەکات وە ناوی ئەنێن ماچ کردن ـ کە حەرامە بە کۆ دەنگی زانایان ـ کە دەڵێن سەلامەتە لێی بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە پێویستە دوور بکەوێتەوە لە هەموو فیتنەیەك و گومانێك و هۆکارێك ئەو ڕێگایانەش بگیرێ کە حەرامن.

والحمدلله رب العالمین